چاپی دووەم

ئادەم کیونەش

# 100

# ڕێسای بنەڕەتی لە
# پەروەردەکردنی
# ندالدا

ەمەنی 7-14 ساڵ

پێشکەشە بەو

گەورەساڵانەی لە چاوی

منداڵەوە تەماشای

دنیا دەکەن و گیانێکی

منداڵانەیان لە ناخیاندا

هەڵگرتووە...

# وتەیەك

باشترین خەسڵەت لە مرۆڤدا ئەوەیە، خۆی چۆنە لە ڕاستیدا، بەو شێوەیە دەربکەوێت، کە ئەوەش بۆخۆی بەرهەمی منداڵییەکی دوور لە ترس و لاسایە. مەولانا وتەنی: "یان بەو جۆرە بە کە دەبینرێیت، یان بەو جۆرە ببینرێ کە هەیت." ئەمە خودی ئەو شتەیە، کە لەناو خۆماندا پێی دەڵێین (بوون بە خاوەن کەسێتی). بەلاتەوە سەیر نەبێت، ئاخر تووی کەسێتی لەدوای حەوت ساڵی و لە کەشێکی پڕ لە دڵنیایی و ئاسایشدا چەکەرە دەکات. هەر بۆیە لەم تەمەنەدا -کە هاوکاتە لەگەڵ قۆناغی قوتابخانەشدا- کەسێتی هەم بنیاد دەنرێت، هەم زۆرترین گورزی تێکشکێنەریشی بەر دەکەوێت. لە لایەکەوە ترس و دڵەڕاوکەی باوان لەتاو ئەوەی سەرکەوتوو بێت لە قوتابخانەدا، لە لایەکی تریشەوە فشاری مامۆستایان بۆ ئەوەی شتی زیاتریان فێر بکەن. لەسەروو هەموو ئەوانەشەوە، سیستمێکی پەروەردە کە هانی لاسایکردنەوە و ئەزبەرکردن دەدات. لە سایەی ئەم ژینگەیەدا، ئیتر منداڵ فێری ئەوە دەبێت کە بەرژەوەندی لەوەدایە ئەوە بکات کە پێی وتراوە و بەو جۆرە بێت کە دەوروبەر پێیان خۆشە.

ئەمە ئەو قۆناغەی تەمەنە کە نازداریی منداڵی کۆتایی پێ دێت و فشاری گەورەکان جێگەی دەگرێتەوە.

ئەمە قۆناغی دروستکردنی (هەستی خەتابارییە)، چونکە نەتوانیوە وەکو پێویست سوود لە تواناکانی بەر دەستت وەربگریت.

ئەمە قۆناغی هەستکردنە بەوەی کە (من گرنگ نیم)، چونکە لەپێناو ئەنجامدانی ئەرک و بەرپرسیارێتییەکان، خۆشەویستییەکەی منداڵیت لێ دەگیرێتەوە.

(٧-١٤) ساڵی، تەمەنی سەرهەڵدانی هەستی (دەستەوسانی و نەتوانین)ە، چونکە بەوەندە لێت ڕازی نابن کە کردووتە، چاوەڕێی زیاتر و زۆرترت لێ دەکەن.

بە دەربڕینێکی دیکە؛ منداڵ لە دووڕیانێکدایە؛ دروستبوونی کەسێتییەکەی یاخود تێکشکانی.

لەبەر هەموو ئەمانە، لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە دەمەوێت ئەو قەرزە بدەمەوە کە بەرامبەر منداڵان لەئەستۆمدایە. ئومێدەوارم، ئەم بەرهەمە یارمەتیمان بدات لە چاوی ئەوانەوە بڕوانینە دنیا.

ڕێز و خۆشەویستیم قبوڵ بفەرموون.

**ئادەم گیونەش**

## ”سەرنجی سەرپەرشتیاری چاپ“

لە دەمی ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەدا بۆ چاپ، یادەوەرییەکانی سەردەمی قوتابخانە بەردەوام بەبەر چاومدا دەهاتن و دەچوون. ئەو ڕۆژانەی بە بێگەردی و دڵپاکیی کیژۆڵەیەکی بچووکەوە، لەبەر دەرگای ماڵماندا یاریم دەکرد و بەدەم ژیانەوە پێدەکەنیم.

پاشان هەنگاوبەهەنگاو سەرسامیی بەرپرسیارێتییەکانی سەرشانم.

نائەقڵانیبوونی چاوەڕوانی و خۆزگەکانم.

سەختییەکانی کچبوون.

ئینجا فشاری دەوروبەر، بۆ ئەوەی منداڵێکی ئاقڵ و سەلار بم.

کاتێک ئەم دێڕەم بەرچاو کەوت: (منداڵی ئاقڵ و سەلار نییە، کە وتت منداڵ، واتە هەڵبەزودابەز، جۆشوخرۆش.) بەزەیم بە منداڵیی خۆمدا هاتەوە.

بەڵێ، هەر دێڕێکی بۆنی یادگارییەکی لێ دەهات، لە هەندێکیاندا بزە دەکەوتە سەر لێوم، لە هەندێکیشیاندا خەم دەیگرتم.

ئینجا هاتمەوە بۆ ڕۆژگاری ئێستا و تەماشایەکی پڕسۆزی منداڵەکانی خۆمم کرد، زۆر شت هەیە دەتوانم بیکەم بۆیان!

هیوادارم ئەمە بۆ ئێوەش دەستپێک بێت، دەستپێکی ڕوانینە ژیان و پەروەردە لە چاوی ئەوانەوە.

کاتێکی خۆش بۆ هەمووتان...

**گۆنجا ئانڵ**

# 1

## منداڵی لە سێ قۆناغ پێک هاتووە:

## **وابەستەیی، هۆگری، گونجان**

سالانی سەرەتای منداڵی، قۆناغی وابەستەبوونی پڕدڵنیاییە. ئەم قۆناغەش، تەمەنی نێوان (٠-٤) ساڵی دەگرێتەوە.

قۆناغی وابەستەبوونی پڕدڵنیاییش لەناو خۆیدا دەبێت بە دوو بەشەوە: تەمەنی (٠-٢) وابەستەیی، تەمەنی (٢-٤) جیابوونەوە.

وابەستەبوونی پڕدڵنیایی کاتێک تەندروست دەبێت، کە ئەو منداڵە لەلایەن (یەک) کەسەوە چاودێری بکرێت.

منداڵ لەم قۆناغەدا چەندە پێویستییەکانی لەلایەن دایکییەوە لە کاتی خۆیدا و بە بڕی پێویست بۆ دەستەبەر بکرێت، ئەوەندە منداڵێکی هێمن و ئاسوودەی لێ دەردەچێت. ئەم ماوەیە چەندێک بەبێ کێشە تێپەڕ ببێت، دواتر ئەوەندە بەئاسانی لە دایکی جیا دەبێتەوە.

دوابەدوای وابەستەبوونی پڕدڵنیاییش، منداڵ پێویستی بەوەیە وابەستەی زیاد لە کەسێک ببێت: باوکی، مامی، خاڵی، پووری، منداڵەکەی دراوسێیان، هاوڕێیانی باخچەکەی. بەرهەمی ئەم وابەستەبوونەش، گەشەسەندنی هەستی (هۆگری)یە. لەم ڕووەوە، هۆگری بە یەکێک لە پێویستییەکانی منداڵانی تەمەن (٧-١٤) ساڵی دادەنرێت.

سروشتی منداڵ وایە؛ لەکوێدا هەست بە باشی بکات و ئاسوودە بێت، حەز دەکات سەر بەو شوێنە بێت و خووی ئەو شوێنە دەگرێت. ئەگەر ئەوەندەی لەلای هاوەڵەکانی ئاسوودەیە لەماڵەوە ئاسوودە نەبێت، هۆگری ئەوان دەبێت نەوەک خێزانەکەی، بگرە هەست بە بێگانەیی و نامۆییش دەکات لەلایاندا.

دروستبوونی هەستی (هۆگری بۆ خێزان) لەلای ئەو منداڵانەی چوونەتە قوتابخانە، بەوە دەبێت بەخێوکاران لەو هەڵوێست و ڕەفتارانە خۆیان بەدوور بگرن، کە دەبنە مایەی شکاندنەوە و بریندارکردنی هەست و سۆزیان.

# 2

# تەمەنی (7-14) ساڵی، تەمەنی هۆگربوونە

ئەو منداڵەی پێش (٧) ساڵی، ئاواتەخواز بوو خولەکێك لە دایکی جیا نەبێتەوە، لەپاش ئەو تەمەنە، دەبینی دڵی بە دایکی داناساچێت. ئەم پێویستییە تازەیەی -هۆگری دەیداتە بەر بۆ ئەوەی داوای قەرەباڵغی، هاوڕێ، کۆڵان، خوشک و برا بکات.

منداڵانی ئەم تەمەنە کە بە منداڵی گەمە و یاری ناسراون، لە هەموو شتێک زیاتر پێویستیان بەوەیە لەناو گرووپێکدا خۆیان ببیننەوە.

خۆبینینەوە لەناو گرووپ و کۆمەڵدا، بناغەی ئەو پێویستییە کە پێی دەڵێین (هۆگری).

# 3

مندالْ هۆگریی
بۆ کویْ هەبیْت،
**خووی ئەو شویْنە**
**دەگریْت**

هۆگری، ناوی ئەو هەستەیە کە لە مرۆڤدا دروست دەبێت، کاتێک لەناو کۆمەڵێکدا هەست بە ئاسوودەیی دەکات.

منداڵ هەوڵی خۆچواندن و لاساییکردنەوەی ئەو کەسانە دەدات، کە پێیان ئاسوودەیە و لەلایاندا هەست بە دڵنیایی دەکات، خوویان دەگرێت؛ وەک ئەوان دەجووڵێتەوە و وەک ئەوان قسە دەکات.

بەشێکی بەرچاوی ئەو بەدڕەفتارییانەی لە منداڵانی قوتابخانەدا بەدی دەکرێت، هۆکارەکەی ئەوەیە هەوڵ دەدەن لاسایی هەڵسوکەوتی ئەو هاوڕێیانەیان بکەنەوە کە دەخوازن هۆگریان ببن.

بۆ نموونە؛ ئەگەر جنێو و قسەی ناشیرین لەناو برادەرەکانیدا بڕەوی پەیدا کردبێت، ئەویش دەست دەداتە ئەو خووە، چونکە نایەوێت لەناویاندا شاز دەربکەوێت و سەرەنجام هەست بە نامۆیی بکات.

ئەو منداڵەی کە زیاتر هۆگری کۆمەڵە و گرووپەکانی دەرەوەی خێزانە، چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێت بەها و کلتووری خێزانەکەی هەڵبگرێت، چونکە منداڵ ئینتیمای بۆ کوێ هەبێت، تەرزی ژیان و بیرکردنەوەشی بەگوێرەی ئەوە ئاراستە دەگرێت.

بۆیە پێشنیارمان بۆ بەخێوکارانی بەڕێز ئەوەیە؛ لەبری ئەوەی بەزۆر ڕەفتارێکی دیاریکراو بەسەر منداڵەکەیاندا بسەپێنن، باشتر وایە کەشێک بڕەخسێنن کە ئەو تیایدا هەست بە بوونی خۆی بکات و هەناسەی ئاسوودەیی هەڵبمژێت، چونکە لە سایەی ئەوەدا هۆگری خانەوادەکەی دەبێت و حەز دەکات خوو و ڕەوشتی بچێتەوە سەر ئەوان.

# 4

مناڵ ئەگەر لە
خێزانەکەی ترازابێت،
**پەیوەندیی توندوتۆڵی**
**لەگەڵ ئەم و ئەودا**
**بایەخێکی ئەوتۆی**
**نییە**

زۆرێک لە بەخێوکاران هەست بە شانازی دەکەن، کە دەبینن دەوروبەری منداڵەکانیان قەرەباڵغە و پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی فراوانیان هەیە.

بەڵام ئەوەی ئێمە لە گەشەی منداڵدا بەلامانەوە گرنگە، ئەوەیە پەیوەندیی لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا بەهێزتر بێت لەو پەیوەندییەکەی کە لەگەڵ برادەر و هاوڕێکانیدا هەیەتی.

بۆ نموونە؛ ئەگەرماڵێک کوڕەکەیان هێندەی برادەرەکانی لە باوکیەوە نزیک نەبوو، خێرا ئەوە دێت بە بیرماندا کە ڕەنگە گرفتێک لە هۆگری و ئینتیمای کوڕەکەدا هەبێت بۆ خێزانەکەی. هەمان شت بۆ ئەو کیژەش ڕاستە کە هەموو دەردەدڵێکی خۆی لای هاوڕێ کچەکانی دەکات و هیچ لای دایکی نادرکێنێت.

ئەگەری سەرهەڵدانی گرفتی ڕەفتاری لای ئەو منداڵانەی لە خێزانەکانیان دابڕاون و خۆیان داوەتە دۆست و برادەرەکانیان، لە منداڵانی تر زیاترە.

چونکە یەکێک لە مەرجەکانی گەشەی کەسێتیی تەندروست ئەوەیە، بەهێزترین پەیوەندیی ئەو کەسە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی خۆیدا بێت.

5

ئەوماڵەی منداڵی
سەروو (7)ساڵیان
هەیە،
**مەرجە کۆبوونەوەی**
**خێزانییشیان**
**هەبێت**

ئاشکرایە منداڵ لەناو خێزاندا فێری هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت، چۆنێتی سڵاوکردن و بەخێرهاتنی میوان، بازاڕکردن و...هتد، لە باوانیەوە فێر دەبێت.

بەڵام مەرجیش نییە دەرفەتی ئەوەی بۆ هەڵبکەوێت، هەموو هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکان لەوانەوە ببینێت. هەرچۆنێك بێت ئەو پێویستی بەوەیە، بزانێت لە چ شوێنێکدا بە چ شێوەیەک مامەڵە دەکات.

بۆ نموونە؛ کاتێك دەچێت شتێک بکڕێت، ئەگەر پارەکەی بەشی نەکرد، چی بکات؟ ئەگەر لەسەر شۆستە خۆی کێشا بە کەسێکدا، چۆن داوای لێبوردنی لێ بکات؟ کاتێك دوو هاوڕێی دەبێت بە شەڕیان، ئەم پێویستە چی بکات؟ ئایا دروستە پشتی ئەوەیان بگرێت کە زیاتر لێوەی نزیکە؟ ئەمانە و چەندین وەڵامی تر کە بەدوایاندا وێڵە.

لەم ڕووەوە، ئەو خێزانانەی منداڵی حەوت ساڵ و بەرەو سەرەوەیان هەیە، پێویستە هەفتەی جارێک کۆ ببنەوە و باسوخواستی ژیانی ڕۆژانە لەناو خۆیاندا تاووتوێ بکەن. دەکرێت ئەم دانیشتنانە بکرێت بە بۆنەیەک بۆ ناساندنی ڕێساکانی ژیان و هەلێک بۆ فێربوون لە ئەزموونی باوانەوە.

دەشێت دانیشتنەکان سنووردار نەبن بە باسکردنی گرفتی منداڵەکانەوە، بەڵکو دەکرێت دایک و باوکیش باسی ئاستەنگەکانی ژیانی ڕۆژانە و کاری خۆیان بکەن. سوودی ئەمە لەوەدایە، هەستی پێکەوەیی و هۆگری لەناو ئەندامانی خێزاندا توندوتۆڵ دەکاتەوە، هەروەها هەستی گرنگی و بایەخیش لای منداڵ دروست دەکات.

# 6

پێوەری سەرکەوتنی
مامۆستا لەناو پۆلدا
ئەوەیە، قوتابییەکانی
فێر بکات خۆیان
بەڕێوە ببەن

لەوە خۆشتر نییە بۆ منداڵی قوتابخانە، ببینێت توانای ئەوەی هەیە خۆی کارەکانی خۆی ئەنجام بدات.

تەنانەت ئەوەندە گرنگە، وەک پێداویستی وایە بۆی.

کاتێك منداڵ کارێک بەسەرکەوتوویی ئەنجام دەدات، هەست بە دڵخۆشییەکی بێئەندازە دەکات، ئەوەش جۆشوخرۆشی دەداتێ بۆ ئەنجامدانی کاری زیاتر و تاقیکردنەوەی شتی دیکە.

لە سایەی ئەمەشەوە گەشەی بەرەوپێش دەچێت، کە لە ڕاستیدا دەتوانین بە پرۆسەی (خۆسەلماندن)یش ناوی ببەین.

یەکێک لە کۆسپەکانی بەردەم منداڵی قوتابخانە ئەوەیە، ڕێگریی لێ دەکرێت کاتێك دەیەوێت بوونی خۆی بسەلمێنێت. گەورەساڵێک دێت و بە ئارەزووی خۆی ئاڕاستەی دەکات.

سەرئەنجام ئەویش هاندەرە ناوەکییەکەی لەدەست دەدات، لەجیاتی ئەوەی بە (حەزەوە) کارەکە بکات، فێر دەبێت بە (ناچاری) بەڕێی بکات.

ئەو منداڵانەی لە ئەنجامی زۆرلێکردن کار دەکەن، پاش ماوەیەک بێزار دەبن لە هەموو پرۆسەیەک کە فێربوونی تێدا بێت.

چونکە حەز گرنگترین هاندەرە بۆ فێربوون.

لەم ڕوانگەیەوە، گەورەترین چاکەی مامۆستایان لەگەڵ منداڵانی قوتابخانەدا ئەوەیە، فێریان بکەن خۆیان (خۆیان بەڕێوە ببەن). مەبەستمان لە خۆبەڕێوەبردن، ئاشناکردنی منداڵە بە شێوازی ئاڕاستەکردنی هەست و بیرکردنەوە و ڕەفتارەکانی.

منداڵ کاتێك دەتوانێت خۆی بەڕێوە ببات، کە گەورەکان ڕێنیشاندەر بن نەوەک بەڕێوەبەر.

# 7

## ئەو پەروەرشیارەی ڕێگە بە منداڵەکەی دەدات بە منداڵی بژی، پەروەرشیارێکی سەرکەوتووە

لای هەمووان ئاشکرایە، پەروەردە و فێرکردن پێگەیەکی بنچینەیی هەیە لە پێگەیاندنی منداڵدا.

بەلام ئەوەش ڕوونە کە تەواوی ژیان بریتی نییە لەوە.

منداڵ چەندە پێویستی بە فێربوونە، ئەوەندەش پێویستی بەوەیە یاری بکات و کاتی خۆشی بەسەر ببات، قاقا لێبدات و لەگەڵ هاوڕێکانیدا گاڵتەوگەپ بکات.

ناکرێت سەرتاپای ژیانیان بە فێربوون و فێرکاری بەڕێ‌بچێت.

فێرکاری سەرکەوتوو لە چوارچێوەی کاتی دیاریکراوی قوتابخانەدا کاری خۆی تەواو دەکات و شتێک ناهێڵێتەوە بۆ دەرەوەی قوتابخانە.

لە ڕووی سۆزدارییەوە منداڵ چەندە تێر و تەواو بێت، توانا ئەقڵییەکانی ئەوەندە بەهێز دەبێت.

گرنگیدان بە سەرکەوتنی ئەقڵی و فەرامۆشکردنی لایەنی سۆزداری، کەلێنی گەورە لە کەسێتی منداڵدا دروست دەکات.

# 8

## قوتابیی بەر دەستی پەروەردەکارە توندەکان سەرکەوتوون، بەڵام لە هەمان کاتدا شەڕەنگێزیشن

منداڵی قۆناغی قوتابخانە، لە ڕووی هێز و توانای جەستەییەوە لە مامۆستاکانی بێهێزترە.

مامۆستا بەئاسانی دەتوانێت هێز و دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت، کە بێگومان ئەوەش زیان بە کەسێتیی قوتابییەکان دەگەیەنێت.

بۆیە ئەوانیش لەپێناو خۆپارێزی لە تووڕەیی مامۆستا، کۆششی زیاتر دەکەن و زۆر لە خۆیان دەکەن بۆ سەرکوتکردنی هەستەکانیان.

کەشێکی لەو شێوەیە ڕەنگە ئاستی خوێندنی قوتابی بەرەوپێش بیات، بەڵام لە هەمان کاتدا نابێت ئەو دەرئەنجامە نەرێنییانەش فەرامۆش بکرێت کە لەسەر لایەنی دەروونی و سۆزداریی قوتابییەکان دایدەنێت. لەبری ئەوەی خۆیان لە ڕاستیدا چۆنن ئا بەو جۆرە بن، لە ترسدا دەچن بەو جۆرە دەبن کە بەلای مامۆستاکەیانەوە پەسەندە.

نامۆبوون بە خود، یان خۆنمایشکردن بە جۆرێک کە خۆت لە ڕاستیدا بەو جۆرە نیت، بە سەرچاوەی زۆرێک لە پەشێوییە ڕەفتاری و کەسییەکان دادەنرێت.

# 9

## کەشی سەرکوتکەر، منداڵ تووشی بزۆکی دەکات

یەکێک لە گەورەترین پێویستییەکانی منداڵی قوتابخانە، جووڵەیە.

تا لە جووڵەدا بێت، گەشەی زیاد دەکات.

تەنانەت جموجووڵ بە یەکێک لە ئاماژەکانی گەشەی ئەقڵیش دادەنرێت. لە کاتی جووڵەدا سووڕی خوێن خێرا دەبێت، واتە بڕێکی زیاتری خوێن بۆ مێشک دەچێت، کە ئەوەش دەبێتە مایەی چالاکبوونی. فێربوونی مێشکی چالاک، ئاسانترە.

هەستانە سەر پێ و ئەنجامدانی کۆمەڵە جموجووڵێکی دیاریکراو لەناو پۆلدا، ئاستی فێربوون بەرز دەکاتەوە.

تێبینییەکی بچووك هەیە گرنگە ئاگاداری بین: چەندە ڕێ بگرین لە جموجووڵی منداڵان، پێویستییەکەیان بۆ جووڵان ئەوەندە زیاتر دەبێت.

بۆیە ئەو منداڵانەی لە ژینگەی سەرکوتکەردا وانە دەخوێنن، هەر کە گوێیان لە دەنگی زەنگ دەبێت، بە جارێک شاڵاو دەبەن بۆ دەرگای پۆل و بە ڕاست و چەپدا بڵاوەی لێ دەکەن.

## 10

باشترین فێرکار ئەوە نییە
کە قوتابییەکانی فێری
شتی زۆر دەکات، بەڵکو
ئەو فێرکارەیە کە فێری
(چۆنێتیی فێربوون)یان
دەکات

ئامانجی پەروەردە و فێرکاری ئەوە نییە، کەسانێک پێبگەیەنێت کە بۆ فێربوون هەمیشە پێویستیان بە کەسانی تر بێت..

پێشکەوتنی سیستمی پەروەردە و فێرکاری بەوە دەپێورێت، کە تا چەند سەرکەوتوو بووە لەوەی کارامەیی بەدەستهێنانی زانیاری و فێربوونی سەربەخۆ دەست تاکەکانی بخات.

زانیاریی ئامادەکراو وەکو بەربەست وایە لەبەردەم فێربوونی منداڵ.

بەڵام ئەگەر لە ڕێگەی بزواندنی پەرۆشی و خولیای پشکنینەوە، فێری (چۆنێتیی بەدەستهێنانی زانیاری)یان بکەین، ئەوکات زانیارییەکان چانسی مانەوەیان زیاتر دەبێت. ڕاستە پرۆسەکە هێواشتر ڕێ دەکات، بەڵام ئەنجامەکەی بەرهەمدارترە.

دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ منداڵدا و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی و بە بایەخ ڕوانینە ئەو شتانەی جێی بایەخی ئەون، قەڵەمبازێکی مەزن بە فێربوونی منداڵ دەدات.

بە بڕوای من، یەکێک لە هەرە جوانترین خەسڵەتەکانی فێرکار ئەوەیە، ڕێز لە ڕیتمی فێربوونی منداڵ بگرێت.

# 11

## دروست نییە
## منداڵیی ڕۆڵەکانمان
## بە هی خۆمان
## بەراورد بکەین

بەراورد یەکێکە لە ئاستەنگە گەورەکانی بەردەم گەشەی کەسێتی.

بەراوردکردنی منداڵ بە هاوڕێ زیرەکەکەی قوتابخانەی، بە منداڵەکەی دراوسێ، بە خوشکەکەی/براکەی...

بەراورد وەک میکانیزمێکی کۆنترۆڵی دەرەکی، نەک هەر سوود بە منداڵەکانمان ناگەیەنێت، بگرە زیانیشیان لێ دەدات، چونکە دەبێتە مایەی دڵەڕاوکە و پرۆسەی بنیادی خود دوا دەخات.

لە بەراوردکردنی منداڵ بە کەسانی تر خراپتریش هەیە، ئەویش ئەوەیە بەراوردی بکەی بە منداڵییەکەی خۆت. بۆ نا! لە کاتێکدا کە ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە هەستی (دەستەوسانی و نەتوانایی) بەرهەم دەهێنێت.

ئەو منداڵەی زوو زوو دەدرێتەوە بەگوێیدا کە نەچووەتەوە سەر دایکی و باوکی و لەوان ناچێت، هەست بە داماویی خۆی دەکات و هێز لەدەست دەدات.

باشتر وایە بە مەبەستی بەراوردکردن بەسەرهاتی منداڵیی خۆمانیان بۆ نەگێڕینەوە، بەڵکو دەرفەتیان پێ بدەین خۆیان پەند و وانەی لێ دەربێنن.

12

# داواکردنی شتانێک لە منداڵ کە لەسەروو تواناوەیەتی، بزێوی دەکات

بەشێکی گرنگی گەشەی کەسێتی لەوەدایە، ڕازی بیت بەو هێندەی کە منداڵەکەت لە توانایدایە بیکات.

بەتایبەت لە منداڵانی قوتابخانەدا، ئەمە وەکو پێویستی وایە. ئەو منداڵانەی بەو جۆرە ڕێز لە سنووری تواناکانیان دەگیرێت، هەست بە هێز و توانا دەکەن لە خۆیاندا و هەوڵی ئەنجامدانی شتی زیاتر دەدەن.

جاری وایە لە ڕێگەی دانانی ئامانجی گەورەوە، منداڵەکانمان تووشی هەڵپە و چاوچنۆکی دەکەین. ڕاستە هەڵپە دەتگەیەنێت بە سەرکەوتن، بەڵام دەبێت بزانرێت کە ئەوە سەرکەوتنێکی بەردەوام نییە، چونکە لە کۆتاییدا خاوەنەکەی دووچاری شەکەتی دەکات.

ئەو شەکەتییەش، هەڵچوون و شەڕانگێزی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

لەبەرئەوە پێشنیارمان بۆ بەخێوکار و پەروەردەکاران ئەوەیە، دەستخۆشی و پێزانینیان هەبێت بۆ ئەو شتانەی کە منداڵ لە سنووری تواناکانی خۆیدا ئەنجامیان دەدات، چونکە ئەم پێزانینە وای لێ دەکای ورەی ئەنجامدانی شتی تریشی بۆ دروست ببێت.

# 13

# پەروەردەکاری سەرکەوتوو، قوتابییەکەی لەناو وانەدا فێر دەکات

ژیان تەنیا لە قوتابخانە پێک نەهاتووە.

منداڵ یاریی هەیە، دایک و باوک و خوشک و برای هەیە و دەیەوێت کاتی خۆشیان لەگەڵ بەسەر ببات.

بێبەشکردنی لە هەموو ئەو شتانەش بە بیانووی سەرکەوتن و بەدەستهێنانی نمرەی بەرز، پێشێلکردنی مافە سروشتییەکانیەتی.

شتێکی ئاساییە، جاروبار مامۆستا داوای یارمەتی لە دایک و باوک بکات بۆ فێرکردنی هەندێک لەو بابەتانەی کە لەناو پۆلدا فریایان ناکەوێت. گرفتەکە لەوەدایە ئەمە بگۆڕێت بۆ دۆخێکی بەردەوام، چونکە ئیتر دەبێت دایک و باوک دەست لە دایکایەتی و باوکایەتی هەڵبگرن و ببن بە مامۆستا لەماڵەوە، بێگومان ئەمەش لە قازانجی گەشەی منداڵدا نییە.

گەشەی منداڵ بەندە بەوەی تێر بخوات لە دایکایەتی و باوکایەتیی باوانی.

# 14

ئەو دایک و باوکانەی
خەریکی مامۆستایەتین
لەناو ماڵدا،
**دایک و باوکایەتییەکەی**
**سەرشانیان فەرامۆش**
**دەکەن**

بەشێک لە مامۆستا و پەروەردەکاران لەژێر ناوی (ئەرکی ماڵەوە)دا، ئەرکێکی زیادە دەخەنە سەرشانی دایکان و باوکان.

لە ڕوانگەی ئەوانەوە، شکستی قوتابی لە قوتابخانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەرکەکانی ماڵەوەی جێبەجێ ناکات.

ئەمە لە کاتێکدا منداڵ لە قوتابخانە و لەگەڵ مامۆستاکەیدا فێر دەبێت، نەک لە ماڵەوە و لەگەڵ دایک و باوکیدا.

وەک دەبینن، ئەو دایک و باوکانەی ڕۆڵی مامۆستایەتی دەگێڕن لە ماڵدا، ناتوانن وەک پێویست چێژ لە دایکایەتی و باوکایەتی وەربگرن و کەشێکی خۆش بخوڵقێنن.

توێژینەوەکان دەریانخستووە کە کاریگەریی (ئەرکی ماڵەوە) لەسەر فێربوونی منداڵ لە قۆناغی بنەڕەتیدا، تەنیا لە هەزاردا یەکە.

پێم وایە ئەو کاریگەرییە کەمە ئەوە ناهێنێت، پەیوەندیی سروشتیی نێوان باوان و منداڵ بکەین بە قوربانی.

# 15

ئەو نمرەیەی قوتابی
بەدەستی دەهێنێت،
لە هەمان کاتدا نمرەی
(توانای مامۆستایەتی)ی
فێرکارەکەشیەتی

ڕۆڵی قوتابی لە قوتابخانەدا بەندە بە کۆمەڵە هۆکارێکەوە، کە ڕەنگە گرنگترینیان کارامەیی مامۆستاکەی بێت لە بواری فێرکاریدا.

مافی خۆیەتی کۆنمرە و ئەو شتانە نەکرێت بە تەنیا پێوەری سەرەتا و کۆتایی بۆ سەرکەوتن یاخود شکستی قوتابی، چونکە توانای مامۆستا لە گەیاندنی بابەتەکەی و دواندنی قوتابییەکەی، ڕۆڵێکی ئێجگار مەزنی هەیە لە پرۆسەکەدا.

نمرەی بەرزی چەند قوتابییەک مانای ئەوە نییە ئەوانی تر کۆشش ناکەن و تەمەڵن، بەڵکو لایەنێکی مەسەلەکە ئەوەیە ئەو مامۆستایە تا چەند سەرکەوتوو بووە لەوەی ڕەچاوی ئاستی تەواوی قوتابییەکانی بکات.

بۆیە کارت پێوەری هەڵسەنگاندنی نمرەی قوتابی نییە بەتەنیا، بەڵکو پێوەری هەڵسەنگاندنی ئاستی مامۆستا و دایک و باوکیشە.

# 16

## بناغەی سەرکەوتن لە فێرکاریدا، کارکردنە لەسەر توانا ناوەکییەکانی فێرخواز

”

یەکێک لە دیارترین خەسڵەتەکانی قۆناغی منداڵی، خولیای پشکنینە.

خولیای بۆ هەموو شتێک هەیە: باڵندە، مێروو، ئاژەڵ، مرۆڤ.

لە سایەی ئەمەدا، بەردەوام شتی نوێ فێر دەبێت.

فێرکاری شارەزا ئاگاداری ئەم لایەنە بەهێزەی سروشتی منداڵە، لەبەرئەوە گرنگیی پێ دەدات و هەوڵ دەدات لە دەلاقەی ئەو بزوێنەرە ناوەکییەوە کار لەسەر تواناکانی بکات.

لەسەر بنەمای پەرۆشی و خولیاکانی، پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ دروست دەکات و لەگەڵیدا ڕێ دەکات.

“

# 17

فێربوونی ڕاستەقینە

سێ پلیکانەی هەیە:

**پەرۆشی، ئارەزوو،**

**ویست**

فێربوونی پرۆسەیەکە پاڵنەرەکەی یان ناوەکییە یان دەرەکی،

خەڵات و سزادوو نموونەن بۆ پاڵنەری دەرەکی.

ئەو جۆرە فێربوونەی کە پاڵنەرەکەی دەرەکییە، دڵەڕاوکە زاڵە بەسەریدا، دڵەڕاوکەش ڕێگرە لەبەردەم فێربوونی درێژخایەندا.

هەروەها پاڵنەری ناوەکییە لە سێ وچان پێک هاتووە، کە یەکەمیان پەرۆشییە،

منداڵ کە شتێکی نوێ دەبینێت، پەرۆشیی بۆ دەجوولێت.

پەرۆشی، ویستی فێربوونە لە ناخی مرۆڤدا، بۆ ئەو شتانەی کە نوێن بەلایەوە و سەرنجیان ڕادەکێشێت.

ئەگەر هیچ بەربەستێک نەیەتە پێش ئەم پاڵنەرە، دوا جار پلەیەک دەچێتە پێش و دەگۆڕێت بۆ (ئارەزوو). ئارەزووش منداڵ دەداتە بەر، بۆ ئەوەی بە ڕۆح لەگەڵ ئەو شتەدا ئاوێتە بێت کە ئەنجامی دەدات.

هەر کاتێکیش هەستی کرد توانای ئەنجامدانی ئەو کارەی هەیە کە ئارەزوویەتی، ئیتر (ویست)ی ئەنجامدان و تاقیکردنەوەی شتی نوێشی لەلا دروست دەبێت.

هەر ئەم ویستەشە وای لێ دەکات بەردەوام لە فێربووندا بێت.

دەستوەردانە پاڵنەری ناوەکیی منداڵ، دەبێتە هۆی ئەوەی ئارەزووی بڕوێت و ویستی خامۆش بێت.

بۆیە کاتێک مامۆستا دەیەوێت شتێک فێری قوتابییەکانی بکات، زۆر گرنگە سەرەتا پەرۆشییان بۆ شتەکە بجوولێنێت. بەردەوامیی پەرۆشیش، بەندە بەوەی ئەو شتەی بخەیتە بەر دەست کە ئارەزووی بۆی جوولاوە. دروست نییە دەست بخرێتە ئەو کارانەوە، کە ئەو بە ویست و ئارەزووەوە خەریکیانە. هەروەک چۆن نابێت سزا بدرێت لەسەر ئەو شتانەی لە توانایدا نییە، ئاواش نابێت زیادەڕەوی بکرێت لە پیاهەڵدان و پاداشتکردنیدا کاتێک شتێک دەکات، نەبادا بەو هۆیەوە ویستەکەی سست بێت.

# 18

## بەرزترین خەسڵەتی فێرکاریی نموونەیی لەوەدایە، فێری هونەری فێرکردن ببێت

زۆربەی جار، پشکی شێر لە شکستی قوتابخانە دەخرێتە ئەستۆی منداڵان.

هەڵبەتە ئێمە دەزانین هەموو منداڵێک -ئەگەر گرفتی ئەقڵی لەئارادا نەبێت- شێوازی فێربوونی تایبەت بە خۆی هەیە.

منداڵی وا هەیە لە ڕێگەی بیستنەوە فێر دەبێت، هی واش هەیە لە ڕێگەی بینینەوە، هەندێکی تر بە نووسین و هەندێکی تریش لە ڕێگەی ئاخاوتنەوە. ئازایەتیی فێرکار لەوەدایە، شێوازی فێربوونی دانەبەدانەی قوتابییەکانی بدۆزێتەوە و لەو ڕێگەیەوە بیاندوێنێت.

شکستی هەندێك قوتابی لە خوێندندا، ڕەنگە بەشێکی هی ئەوە بێت کە مامۆستاکانیان وەکو پێویست خۆیان فێری هونەری فێرکردن نەکردووە و نەیانتوانیوە کار لەسەر هۆش و هزری قوتابییەکانیان بکەن.

هەر بۆیە مامۆستای سەرکەوتوو لەبری خەتابارکردنی قوتابییەکەی بەوەی کە (فێر نابێت)، دەچێت خۆی فێری شێوازە جۆربەجۆرەکانی فێرکردن دەکات و ئاشنایی پەیدا دەکات لەگەڵ جۆرە جیاوازەکانی زیرەکی و وردەکارییەکانی پرۆسەی فێربوون لە منداڵدا.

# 19

## فێرکار کە گوێی نەگرت، گوێشی بۆ ناگیرێت

ئامانجی بنەڕەتی لە پەروەردەدا، بریتییە لە فێربوونی قوتابی،

فێرخوازی ڕاستەقینە، بەردەوام بەدوای پرسیاری نوێوەیە. چەندە وەڵامی پرسیارەکانی وەربگرێت، ئەوەندە خولیای فێربوونی شتی نوێی لەلا دروست دەبێت.

بەپێچەوانەوە، وەڵامنەدانەوەی پرسیارەکانی دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی ئەو تاسە و خولیایەی کە هەیەتی بۆ فێربوون، هەر ئەمەشە وا دەکات پەیوەندیی لەگەڵ مامۆستاکەیدا بپچڕێت.

مامۆستا لەسەر تەختە سەرگەرمی ڕوونکردنەوەی بابەتێکە، بەڵام ئەو تاقەتی نییە بەتاسەوە گوێ بگرێت. چونکە زانیارییەکانی پێشتر فێر نەبووە، بۆیە ئێستا ناتوانێت بابەتەکان پێکەوە ببەستێتەوە، ئیتر بەم شێوەیە ئەڵقەکانی زنجیرەی فێربوون لێک دەترازێن.

لە کەشێکی ئاوادا، قوتابی چەندە زۆریش لە خۆی بکات، هێشتا هەر ناتوانێت بەسەرنجەوە گوێ ڕادێرێت.

سەرکەوتنی منداڵ لە وانەکانیدا، پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بە سەرکەوتنی مامۆستا لە وانەوتنەوەدا.

# 20

ئەم جۆرە دەربڕینانە:

**”متمانەم پێتە، دڵنیام زۆر باش دەبێت!“**

زیاتر دڵەڕاوکە بەرهەم دەهێنێت وەک لە سەرکەوتن

"دڵنیام سەرکەوتوو دەبیت!" و هاوشێوەکانی، دەبنە مایەی دروستکردنی فشار لەسەر منداڵ. فشاری ئەوەی ئەگەر سەرکەوتوو بێت، "لە جێی متمانەدا" دەبێت، ئەگەر پێچەوانەکەشی بێت، (لە جێی متمانەدا) نابێت.

هەستکردن بەوەی کە جێی متمانەی کەسانی تر بێت، بارێکی گرانە لەسەر دەروونی ئادەمیزاد.

زۆر گرنگە، سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی منداڵەکانمان نەبەستینەوە بە مەسەلەی متمانەوە.

سەرکەوتن چۆن شتێکی ئاساییە، سەرنەکەوتن و شکستیش بەهەمان شێوە شتێکی ئاساییە.

ئەوەشمان بیر نەچێت، هیچ شکستێک نییە کە چەندین سەرکەوتنی بچووک لە دووتوێیدا شاراوە نەبێت، بەڵام چاوێکی دەوێت ببینێت.

مەرج نییە قوتابی لە هەموو تاقیکردنەوەیەکدا دەربچێت یاخود نمرەی بەرز بەدەست بهێنێت، یا بەباشی خۆیشی ئامادە کردبێت. هەر ئەوەندەی کە ئەو دەستی داوەتە کتێب و دەفتەر و هەوڵی داوە پرسیارەکان شیکار بکات، ئیتر ئەوە بۆخۆی هەنگاوی بچووکە بە ئاراستەی سەرکەوتن.

لەبەر ئەوە تەنیا گرنگیدان بە ئەنجام و فەرامۆشکردنی هەموو ئەو هەوڵانەی کە لەو پێناوەدا دراوە، ئینجا بەستنەوەی ئەوەش بە متمانەوە، هەموو ئەوانە منداڵ تووشی دڵەڕاوکە دەکات.

# 21

ئەنجامی تاقیکردنەوە
چەندە جەختی لەسەر
بکرێتەوە، نیگەرانی و
دڵەڕاوکە ئەوەندە زیاد
دەکات

هۆكاری سەرەكیی دڵەڕاوكەی كاتی تاقیكردنەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرنجە زۆرەی كە لەلایەن خانەوادە و مامۆستایانەوە دەخرێتە سەر ئەنجامەكان.

دڵەڕاوكە، ترسە لە دەرەنجامێكی گریمانەكراو كە خاوەنەكەی دەترسێت لە داهاتوودا ڕوو بدات.

لە حاڵەتی تاقیكردنەوەدا، منداڵ نیگەرانی ئەوەیە نمرەی بەرز بەدەست نەهێنێت و بەو هۆیەوە لەلای دایک و باوک و هاوڕێكانی لە نرخ و بەهای كەم ببێتەوە.

چەندە زیاتر خزم و كەسوكار خەمی ئەنجامی تاقیكردنەوەكەیان بێت و هەواڵی بپرسن، ئەو ئەوەندە زیاتر هەست بە دڵەڕاوكە دەكات، لەبەر ئەوە گرنگە ئاگامان لەم خاڵە بێت و زۆر لەسەر نمرە و ئەنجام نەوەستین.

"ئەگەر لە تاقیكردنەوە باش بیت/خراپ بیت وا و وا دەبێت! ئەمە كۆتا چانسە! ئەم تاقیكردنەوەیە چارەنووسی تۆ دیاری دەكات. چەند ڕۆژی ماوە بۆ تاقیكردنەوە؟ بەباشی خۆت ئامادە كردووە؟ خەمت نەبێت، تاقیكردنەوەكە ئاسانە، دڵنیام زۆر باش دەبیت." ئەم چەشنە قسانە سەرچاوەی دروستبوونی دڵەڕاوكەن.

# 22

## خوێندنەوە بەتێگەیشتنەوە سەرکەوتن مسۆگەر دەکات، نەوەک خێرا خوێندنەوە

سیستمی کلاسیکی پەروەردە، هانی قوتابیان دەدات بۆ خێرا خوێندنەوە.

لە کاتێکدا خوێندنەوەی خێرا کاریگەریی هەیە لەسەر کەمکردنەوەی ڕێژەی تێگەیشتن لەو دەقەی کە دەخوێنرێتەوە.

جێی خۆیەتی خوێندنی قۆناغی بنەڕەتی کاری زیاتر بکات لەسەر ڕاهێنانی قوتابیان، تاکو کە شتێکیان خوێندەوە لێشی تێبگەن.

خوێندنەوە بەتێگەیشتنەوە بەوە دەبێت، وشەکان دانەبەدانە و لەسەرخۆ بخوێنرێنەوە، پاشان لەگەڵ خوێندنەوەی هەر بڕگەیەکدا، شیکاری بکرێت بۆ ناوەرۆکی ئەو بڕگەیە.

بۆ ئەم مەبەستە، گەورەساڵێک و منداڵێک دەتوانن پێکەوە دەقێک بخوێننەوە. لەدوای خوێندنەوەی هەر ڕستەیەک، واتای ڕستەکە بۆ منداڵەکەدا باس دەکرێت.

پاش ئەوەی منداڵ فێر بوو بەتێگەیشتنەوە بخوێنێتەوە، ئیتر دەتوانێت ڕاهێنان بکات لەسەر خێرا خوێندنەوە. بەڵام ئەگەر دەستبەجێ بەوە دەست پێ بکات، دوای ماوەیەک ئارەزووی خوێندنەوەی نامێنێت.

لە تەمەنی (١٠) ساڵی بەدواوە، ئاساییە منداڵ لەسەر خێرا خوێندنەوە ڕابهێنرێت.

ئەو هەوڵەی کە دەیدەیت لەپێناو ئەوەی منداڵەکەت/ قوتابییەکەت فێری شتێک بکەیت کە پەرۆشیی بۆی نییە، هەوڵێکی بێسوودە، چونکە فێربوونی ڕاستەقینە بەرهەمی پەرۆشبوونە.

فێرکاری سەرکەوتوو ئاگاداری قۆناغە جیاوازەکانی گەشەی منداڵە و دەزانێت لە چ تەمەنێکدا پەرۆشیی بۆ چ شتێک هەیە، بۆیە دەبینی زمانی ئاخاوتنیشی بەگوێرەی ئەوە ڕێک خستووە.

مەرجی بنەڕەتیی فێربوون ئەوەیە، فێرخواز ویستی فێربوونی هەبێت. بەدەستەبەرنەبوونی ئەم مەرجە، فێرکاریش و فێرخوازیش ماندوو دەبن.

# 24

## بەکارهێنانی هەستەوەرەکان لە فێرکاریدا، زامنی درێژخایەنیی پرۆسەکەیە

یەکێک لە کۆسپەکانی بەردەم فێربوون، بریتییە لە بیرنەکەوتنەوەی ئەو شتەی کە فێری بوویت، ئەگینا خودی فێربوونەکە بە جۆرێک لە جۆرەکان ڕوو دەدات.

ئەو زەحمەتەی کە لە دووبارە هێنانەوەی زانیارییەکان بۆ یادگەی کارا تووشمان دێت، بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سوودمان لە هەستەوەرەکان وەرنەگرتووە لە کاتی فێربوونەکەدا.

چەندە هەستەوەری زیاتر لە کاتی فێربوون و وەرگرتنی زانیاریدا بخرێتە کار، بیرکەوتنەوەی ئەوەندە ئاسانتر دەبێت.

فێربوون لە ڕێگەی دوو هەستەوەرەوە، بە فێربوونی زیهنی دادەنرێت. فێربوونیش لە ڕێگەی خستنەگەڕی زیاد لە سێ هەستەوەرەوە، جۆرێکی تری فێربوونە کە بە فێربوونی گرتنەخۆ دادەنرێت.

با بڵێین مامۆستا دەیەوێت پیتی (و) فێری قوتابییەکانی بکات. ئەگەر لەسەر تەختەکە (و) بنووسێت و بیخوێنێتەوە، ئەوا فێربوونی زیهنی بەکار هێناوە، چونکە بینینی پیتەکە لەسەر تەختە و بیستنی دەنگی مامۆستا، پێویستی بە بەکارهێنانی تەنیا دوو هەستەوەر هەیە.

بەڵام ئەگەر سەرباری نووسین و خوێندنەوەکەش، پیتێکی (و) یان بداتە دەست کە لە تەختە یان نایلۆن دروست کراوە، لەو حاڵەتەدا هەستەوەری سێیەم دەخاتە کار کە ئەویش هەستەوەری بەرکەوتنە.

خۆ ئەگەر پیتەکە بۆنێکی دیاریکراویشی هەبێت، ئیدی ئەوکات بیرکەوتنەوەی ئەوەندەی تر ئاسان دەبێت، چونکە هەستەوەری چوارەم هاتووەتە ناو مەسەلەکەوە کە ئەویش هەستەوەری بۆنکردنە.

# 25

## کرۆکی فێربوونی درێژخایەن و بەردەوام، هەستی پەرۆشبوونە نەوەک زۆرلێکردن

پەرۆشبوون، گەورەترین پاڵنەری فێربوونە.

فێرکاری سەرکەوتوو، چرکەساتی جووڵانی پەرۆشیی قوتابییەکەی بە باشترین هەل دەبینێت بۆ گەیاندنی پەیامەکەی، مەبەستەکەی دەبەستێتەوە بەو شتەی قوتابییەکەی پەرۆشیەتی.

ئەو بابەتانەی پەرۆشیی منداڵەکەی جووڵاندوە، ئەگەر سەرنجی گەورەکان بەلای خۆیدا ڕانەکێشێت، ئیتر ئەویش ئارەزووی فێربوونی لاواز دەبێت.

خاڵی لاوازی ئەو قوتابییانەی بە (تەمەڵ) ناو دەبرێن، ئەوەیە پەرۆشییان نەماوە.

ڕاستە هەندێک جار فشار و زۆرلێکردن جێی خۆی دەگرێت و وا لە منداڵ دەکات فێر ببێت، بەڵام پێویستە بزانرێت کە ئەوە فێربوونێکی کاتییە، لە هەمان کاتیشدا ئارەزووی فێربوون ناهێڵێت.

فێربوونێک پەرۆشیی تێدا نەبێت، بە فێربوونێکی بەردەوام و درێژخایەن هەژمار ناکرێت.

# 26

هەموو شتێکی
نوێ سەرنجڕاکێشە
بۆ منداڵ، زانیاری تا
کۆن بێت، پەرۆشی
نامێنێت

منداڵ پەرۆشیی هەیە بۆ ئەو شتانەی نوێن و ئاشنا نییە پێیان.

ڕاستییەکی زانراوە کە کۆنبوون و دووبارەبوونەوەی زانیارییەکان، پاڵنەری فێربوون لاواز دەکات.

بۆ نموونە؛ تەماشای ئەو منداڵانە بکە کە تازە دەچنە قوتابخانە، پەرۆشییەکی زۆریان هەیە بۆ خوێندن، بەتاسەوە دەفتەر و قەڵەم و جانتا دەکڕن، لە سەرەتاوە بەپڕاکردن دەچن بەرەو قوتابخانە.

خۆ ئەگەر لەم قۆناغە بەرهەمدارەدا ئێمەش وەکو خێزان و قوتابخانە بتوانین پاڵپشتییان بکەین، ئیتر ئەوانیش بە یارمەتیی پاڵنەرە ناوەکییەکەی ناخیان، بە شێوەیەکی سەرکەوتوو دەچنە ناو پرۆسەکەوە.

هەر شتێک منداڵ پەرۆشیی بۆی هەبێت، وەکو دەرگایەکی ئاوەڵا وایە کە دەتوانین لێیەوە بچینە ناو دڵ و هۆشیەوە. بەڵام ئەگەر لە کاتی خۆیدا نەچینە ژوورەوە، دەرگاکە بە ڕووماندا دادەخرێت.

فێربوون بۆ ئەو منداڵانەی کە دەرگاکانی پەرۆشییان داخراوە، پرۆسەیەکی ماندووکەرە؛ هەم خۆیان ماندوو دەبن، هەم مامۆستاکانیشیان.

# 27

هەر فێرکارییەک
پەرۆشیی تێدا
نەبێت، فێرکارییەکی
ناسەرکەوتووە

جوانترین تایبەتمەندیی فێرکاریی نموونەیی ئەوەیە توانای جوولاندنی پەرۆشیی قوتابییەکانی هەیە.

لەبەرامبەردا، ئەو فێرکارەی ناتوانێت سەرنجی قوتابییەکانی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، ناتوانین وەسفی فێرکاری سەرکەوتووی بدەینە پاڵ.

خوێندنێکی لەو جۆرە کە تێیدا منداڵ چێژ وەرناگرێت لەو شتانەی فێریان دەبێت، نازانم تا چەند خوێندنێکی سەرکەوتووە! چونکە پاش ماوەیەک زۆربەی ئەو شتانەی بیر دەچێتەوە کە فێریان بووە. بۆیە لە زۆربەی قۆناغەکانی خوێندندا، قوتابی ئەو زانیارییانەی بیر نامێنێت کە لە قۆناغەکانی پێشتردا فێریان بووە.

بۆ نموونە؛ جۆشوخرۆشی ئەو منداڵەی کە حەزی لە ژماردنی پێیەکانی هەزارپێیە، دەبێت مامۆستای بیرکارییەکەشی بهێنێتە جۆشوخرۆش. چونکە لەو کاتەدا کە پێکەوە خەریکی ژماردنی پێیەکانی هەزارپێیەکەن، پاڵنەرێکی ناوەکیی تێدا دروست دەبێت بۆ فێربوونی ژمارەکان.

یاخود ئەو منداڵەی کە حەزی لە مۆزیکە و ئاشنای هونەری کلتوورە جیاوازەکانە، کاتێک لەسەر نەخشە هەڵکەوتەی جوگرافیی وڵاتەکان و شێوازی مۆزیک و هونەرەکانیان دەبینێت، ئارەزووشی بۆ فێربوونی جوگرافیا زیاتر دەبێت.

پێگەیاندنی قوتابیی سەرکەوتوو، کاری ئەو فێرکارانەیە کە دەزانن لە دەرگای هۆش و بیری قوتابییەکانیان بدەن.

# 28

## منداڵ پێویستی
## بە خوێندنەوەی
## ئەو جۆرە کتێبانەیە
## کە پەرۆشیی
## دەجووڵێنن

دەتوانم بڵێم، زۆرێک لە دایکان و باوکان بەهەڕەمەکی کتێب بۆ منداڵەکانیان دەکڕن. زیاتر ئەو کتێبانەیان بەلاوە پەسەندە، کە ناونیشانەکەی یان بەرگەکەی سەرنجڕاکێشە.

بەڵام ئێمە دەزانین هەموو کتێبێک شیاوی ئەوە نییە منداڵ بیخوێنێتەوە. بەر لە هەموو شتێک، پێویستە نووسەری کتێبەکە کەسایەتییەک بێت ئاشنای ڕۆحی منداڵ بێت.

مەرجیش نییە تەرز و شێوازی نووسینی هەموو نووسەرێک، بۆ هەموو منداڵێک گونجاو بێت.

ڕاهاتنی منداڵ لەسەر خوێندنەوە، بەندە بەوەی ئەو چەشنە کتێبانەی بخەیتە بەر دەست کە پەرۆشی و ماخۆلانی پشکنینی دەبزوێنن، ئەمەش داخوازی ئەوەیە پێشتر خۆت شەنوکەوێکی ناوەرۆکەکەیت کردبێت.

هەندێک جار زۆر لە منداڵەکانمان دەکەین کە بۆچی حەزیان لە کتێب خوێندنەوە نییە، کەچی ناچین بزانین حەزیان لە چ جۆرە کتێبێکە و چ تەرزێکی گێڕانەوە لەگەڵیاندا دێتەوە.

خوێندنەوە لای ئەو منداڵانە دەبێت بە خوو کە حەزیان لە چییە ئەوە دەخوێننەوە، نەوەک ئەو منداڵانەی زۆریان لێ دەکرێت بۆ ئەوەی زۆرترین کتێب بخوێننەوە.

پێوەری کتێبی باش، بەرگ و ناونیشانەکەی، واتە تایبەتمەندییە دەرەکییەکانی نییە، بەڵکو ناوەرۆک و شێوازەکەیەتی.

“

# 29

**فێرکاری سەرکەوتوو لە ڕێگەی وروورژاندنی پەرۆشیی قوتابییەکانیەوە و فێرکاری ناسەرکەوتووش لە ڕێگەی سەرکوتکردنەوە، بێدەنگیی ناو پۆل دەستەبەر دەکات**

پەرۆشـی پاڵنەرێکـی ناوەکیی ئەوەنـدە بەهێـزە، کاتێک پەرۆشیمان بـۆ فێربوونـی شتێک دەجووڵێت، بـە تـەواوی بوونمانـەوە خۆمانـی دەدەینـێ.

لـە کەشێکی وادا، بێدەنگـی بـاڵ بەسـەر هەمـوو لایەکـدا دەکێشێت.

فێرکاری سـەرکەوتوو بۆ پاراستنی بێدەنگیی پۆلەکەی پەنا ناباتـە بـەر زەبروزەنـگ، بەڵکو سـوود لـە هێـزی جووڵاندنی مەراقـی قوتابییەکانـی وەردەگرێت.

# 30

# بەکارهێنانی سزا، پەرۆشیی منداڵ ناهێڵێت

بەرۆشی پاڵنەرێکی ناوەکییە، وزەیەکی پڕی ناو ناخی منداڵە.

هەرچی سزایە پاڵنەرێکی دەرەکییە. بەکارهێنانی سزا لە پرۆسەی فێربووندا، زیان لە پاڵنەرە ناوەکییەکەی ناخی منداڵ دەدات و هەستی خۆبەهیچزانی لەلا دروست دەکات.

ئەو منداڵانەی هەست بە سووکایەتی دەکەن و خۆیان لا بێنرخە، چێژ لە فێربوون وەرناگرن و جۆشوخرۆش لەدەست دەدەن.

جاری وایە منداڵ لە ترسی سزا، بە جۆرێک خۆی نیشان دەدات وەک ئەوەی فێر بوویێت، بەڵام ئەوە بە فێربوونی ڕاستەقینە دانانرێت، چونکە بە ترس و دڵەڕاوکەوە فێر بووە و ئەگەری زۆرە دوای ماوەیەک لەبیری بچێتەوە.

# 31

# چارەسەرکردنی کێشە، خەسڵەتی ئەو منداڵانەیە کە ڕێگەیان دراوە خۆیان بسەلمێنن

زۆرتریـــن هـــەوڵ و کۆششـــی منداڵانـــی قوتابخانە، خۆســـەلماندنە.

کاتێـك قژی دادەهێنێت و پۆشاکی جوان دەپۆشێت و حـەز دەکات لەنـاو هاوڕێکانیدا پێگەیەکی هەبێت، مەبەستی ئەوەیە خۆی بسـەلمێنێت.

لەگـەڵ پڕبوونەوەی ئـەم پێداویستییانەدا، کەسێتییەکەشی گەشـە دەکات و هەڵچوونەکانـی هێـور دەبنـەوە و جۆرێک لە ئارامیـی دەروونی بەدەسـت دەهێنێت.

زۆر گرنگـە دایـک و بـاوک لەم تەمەنـەدا نـرخ و بەها بدەن بـە منداڵەکانیـان و ڕێـز لـە بڕیارەکانیـان بگـرن و بەبایەخـەوە گوێیـان بـۆ بگـرن، چونکـە پێویستی بەوەیە هەسـت بکات مرۆڤێکـی گرنـگ و خـاوەن ڕێزە.

ئـەو منداڵانـەی بـەم شـێوەیە مامەڵەیـان لەگـەڵ کـراوە، کاتێـك ڕووبەڕووی کێشـەیەک دەبنـەوە، دنیایان لـێ نایەتەوە یـەک و سـەریان لێ ناشـێوێت. لەبری ئـەوە، بەئارامی هەوڵی دۆزینـەوەی ڕێچارەیـەک دەدەن.

یەکێـک لـە مەرجەکانـی توانـای چارەسـەرکردنی کێشـە ئەوەیـە، ئارامیـی خـۆت بپارێزیـت و بەرچاوڕوون بیت.

گەورەتریـن خاڵـی بەهێزی ئـەو منداڵانەی ڕێگەیـان دراوە خۆیـان بسـەلمێنن ئەوەیـە، هێمـن و بەرچاوڕوونن.

# 32

# شەڕەنگێزی، ڕەنگدانەوەی هەستی خۆبەکەمزانینە

قوولترین هەستی ناو ناخی ئەو منداڵەی نەیتوانیوە خۆی بسەلمێنێت، هەستی بێڕێزیی خودە (خۆی بەلاوە بێنرخە).

ئەم هەستە هۆکاری خۆبەکەمزانینە.

ئەو کەسەی ڕێزی خودی نییە، دەروونی تەژییە لە هەستی نەرێنی بەرامبەر دەوروبەرەکەی.

ئەو منداڵەی خۆی بە کەم دەبینێت لەچاو ئەوانی تردا، ناتوانێت پەیوەندییەکی بنیاتنەر لەگەڵ دەوروبەریدا دروست بکات.

بەگشتی ئەو جۆرە منداڵانە، نائارام و شەڕانی و هاروهاجن.

چەندین بەربەستیان خستووەتە نێوان خۆیان و ئەوانی ترەوە.

نرخپێدان و بە گرنگزانین، لە باشترینی ئەو شتانەن کە پەروەشیاران و فێرکاران بەرامبەر منداڵانی قوتابخانە ئەنجامی بدەن.

# 33

# وەلانان و پەراوێزخستن، مایەی هەستکردنە بە خۆبەکەمزانین

خۆبەکەمزانین، یەکێکە لە گەورەترین بەربەستەکانی بەردەم گەشەی کەسێتی..

خۆبەکەمزانین کاتێک سەر هەڵدەدات، کە هەست بکەیت تەرازووی یەکسانیی نێوان خۆت و بەرامبەرەکەت لە بەرژەوەندیی لایەنی بەرامبەر پارسەنگ بووە.

گرنگیپێدان و پیاهەڵدانی قوتابییەک لەناو هاوپۆلەکانیدا، بە واتای بە سووک تەماشاکردنی ئەوانی تر دێت.

لەنێوان خوشک و براکانیشدا هەر وایە؛ پەسەندکردنی یەکێکیان بەسەر ئەوانی تردا، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوانی تر هەست بە کەمیی خۆیان بکەن.

بەشێک لە گەورەساڵان پێیان وایە لە ڕێگەی بەراوردکردن و تێکدانی یەکسانیی نێوان منداڵەکانیان، دەتوانن زیاتر هانیان بدەن بۆ خوێندن و بەدەستهێنانی نمرەی بەرز، لەبەر ئەوە لەناو گرووپێکدا (زیرەکترینەکە یان باشترینەکە) دەردەهێنن و خەڵاتی دەکەن، گومانیان وایە بەو شێوەیە ئەوانی دی چاوی لێ دەکەن و وورەیان بەرز دەبێتەوە.

لە کاتێکدا ئێمە دەزانین خەڵاتکردنی تاکەکەسێک لەناو کۆمەڵێکدا، وەکو ئەوە وایە ئەوانی ترت سزا دابێت.

بۆیە ئەگەر بڕیار بێت لەناو چەند منداڵێکدا یەکێکیان دەستنیشان بکەین و پەسەندی بکەین، ئەوا دەبێت هەموویان دەستنیشان بکەین و هەمووشیان پەسەند بکەین.

# 34

# ئالوودەبوون لە منداڵدا، دەرەنجامی هەستکردنە بە کەمتوانایی

(ئالوودەبوون) یەکێکی ترە لە گرفتی ڕەفتاریی ئەو منداڵانەی خۆیان بە کەمتوانا و دەستەوسان دەبینن.

بۆ نموونە؛ ئەو منداڵەی لە قوتابخانە هەست بە کەمتوانایی خۆی دەکات، هاوڕێ زیرەکەکانی لەبەر چاوی خۆی گەورە دەکات (سەرسام دەبێت پێیان) و بە هەموو جۆرێک هەوڵی خۆنزیککردنەوە دەدات لێیان، هەست بە داماویی خۆی دەکات لە ئاستیاندا.

سەیر لەوەدایە، ئەگەر شتێک هەبێت ئەم نەتوانێت کارزانی و لێهاتوویی خۆی تێدا نیشان بدات، بە شێوەیەکی نائاسایی سەرسامی ئەوانە دەبێت کە لەو شتەدا سەرکەوتوون، تەنانەت هەندێک جار دەگاتە ئاستی ئالوودەبوون.

زۆرێک لە گەورەساڵان وا گومان دەبەن ئەگەر لای منداڵەکانیان باسی سەرکەوتنی کەسانی تر بکەن، ئەوا منداڵەکانیان چاویان لێ دەکەن و گڕوتین دەدەنە بەر خۆیان. ڕەنگە نەزانن ئەم جۆرە ڕەفتارە زیاد لە ورەبەخشین، هەستکردن بە کەمتوانایی بەرهەم دەهێنێت.

ئیدی لە سایەی ئەم ڕەفتارەدا، منداڵ کەمتواناییەکەی خۆی پشتڕاست دەکاتەوە و دڵنیا دەبێتەوە لەوەی کە گەورەکانیش پێیان وایە (ئەم ناتوانێت).

بەراوردکردن یەکێکە لەو هەڵە نەخوازراوانەی، گەورەساڵان بە نیازێکی باشەوە تێی دەکەون. ئەگەر بیانزانیایە منداڵ بەو ڕەفتارە هەست بە دەستەوسانیی خۆی دەکات لەچاو ئەوانی تردا، دڵنیام دووبارەیان نەدەکردەوە.

جێی خۆیەتی فێرکارانیش ئاگاداری ئەم وردەکارییە بن، بە هۆی هەڵنانی یەک دوو قوتابییەوە، هەستی کەمتوانایی لەوانی تردا دروست نەکەن.

# 35

## یەکێک لە دیارترین خەسڵەتەکانی منداڵی قوتابخانە، شت بیرچوونەوەیە

منداڵانی قوتابخانە ئیشوکاریان زۆرە؛ وانەخوێندن، ئەرکی ماڵەوە، یاری و یاری و... هتد.

لەبەر ئەوە بەشێکی زۆری منداڵان بەبەردەوامی شتێک هەیە لە قوتابخانە بیریان چووبێت؛ یەکێک دەفتەرەکەی بیر دەچێت، یەکێکی تر لاستیکەکەی یان قەڵەمەکەی.

کەسێک ئەوەندە سەرقاڵ بێت، ئاساییە شتیشی بیر بچێت.

لەبری ئەوەی بە هۆی لەبیرچوونەکەیەوە فشاری بخەینە سەر، باشتر وایە یارمەتیی بدەین تاوەکو شتەکانی بیر بکەوێتەوە.

ئەوەشمان بیر نەچێت کە بەکارهێنانی فشار و زۆرلێکردن، ئەوەندەی تر لەبیرچوونەوەکەی زیاتر دەکات.

# 36

## بەکارهێنانی فشار لە پەروەردە و فێرکردندا، دەبێتە مایەی لاوازبوونی منداڵ لە ڕووی سۆزدارییەوە

ئەو فێربوونەی لە ڕێگەی زیهنەوە ئەنجام دەدرێت، ئەگەرچی بە پرۆسەیەکی ئاسان و خێراش دادەنرێت، لە ڕووی ماوەوە کورتخایەنە.

لەبەرامبەردا پرۆسەی فێربوون لە ڕێگەی هەستەکانەوە هەیە، ڕاستە ئەمەیان بەراورد بە ئەو هێواشترە، بەڵام ماوەکەی درێژخایەنترە.

زۆرلێکردن و چاوترساندن دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵان هەستەکانیان سەرکوت بکەن و لە ناخی خۆیاندا گلیان بدەنەوە.

ڕەنگە بەو جۆرە چالاکییە زیهنییەکان خێراتر ببن، بەڵام خۆ کەسێتیی منداڵ تەنیا لەو شتانە پێک نەهاتووە کە فێریان دەبێت، ئەو لە هەمان کاتدا خاوەن ڕەهەندێکی گرنگی دیکەشە کە ئەویش دنیای هەستەکانیەتی، لە ڕاستیدا ئەم لایەنە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە بنیادی کەسێتییەکەیەوە.

لەبەر ئەوە پێویستە گەشەی زیهنی و سۆزداری شانبەشانی یەک برۆن و هیچ کامیان نەکرێتە قوربانی ئەوی دیکەیان.

37

# توندوتیژیی ناڕاستەوخۆ، هێندەی توندوتیژیی ڕاستەوخۆ کاریگەریی ڕووخێنەری هەیە

منداڵێک لێی دەدرێت و منداڵێکی تریش بینەری لێدانەکەیە، ئەوەی دووەمیان بە ئەندازەی ئەوەی یەکەمیان قوربانیی توندوتیژییەکەیە.

چونکە ئەو منداڵەی ڕووبەڕووی توندوتیژی بووەتەوە، دەتوانێت خۆی بخواتەوە و هەستەکانی سڕ بکات، واتە لە ناخیدا جۆرێک لە بەرگری بەرامبەر کاریگەرییە خراپەکانی توندوتیژییەکە پەیدا دەکات.

کەچی ئەو منداڵەی بینەری لێدانەکە بووە، لە قوربانییەکە زیاتر تووشی ترس و خورپە دەبێت، چونکە هیچ نازانێت دەربارەی ئەو ئازارەی قوربانییەکە چەشتوویەتی.

کاتێک منداڵێک لەناو پۆلدا ڕووبەڕووی توندوتیژی دەبێتەوە، دەبێت بزانرێت کە هاوپۆلەکانیشی هێندەی ئەو زیانیان بەر دەکەوێت.

لەبەر ئەوە جێی خۆیەتی دایکان و باوکان بێدەنگ نەبن لە ئاست هیچ جۆرە توندوتیژییەکدا کە بەرامبەر منداڵان ئەنجام دەدرێت، ئیتر گرنگ نییە منداڵی خۆیانی تێدایە یان نا.

38

له کاتی بەکارهێنانی دەغیلەدا، دەبێت ئاگاداری ئەو هێڵە باریکە بین کە لەنێوان دەستپێوەگرتن و خۆپەرستیدا هەیە

گەورەساڵان هانی منداڵەکانیان دەدەن بۆ بەکارهێنانی دەغیلە، مەبەستیانە لەو ڕێگەیەوە فێری ڕەوشتی دەستپێوەگرتن و پاشەکەوتیان بکەن.

بەڵام لە هەندێك باردا، پارە کۆکردنەوەکە لەجیاتی ئەوەی فێری دەستپێوەگرتنی بکات، بەرەو خۆپەرستی پەلکێشی دەکات.

چەندە پاشەکەوتەکانی بە موڵکی خۆی بزانێت، ئەوەندە بەگران لە دەستی دەبێتەوە.

گریمان دایکی یان باوکی داوای هەزار دیناری لێ دەکات، بەڵام ئەو دەڵێت "نەخێر"، یان بەو مەرجە دەیانداتێ کە دواتر بیدەنەوە.

لە ڕاستیدا ئەمە پێی ناوترێت دەستپێوەگرتن، بەڵکو ئەمە لاوازبوونی توانای دەستبەرداربوونە.

بەشێکی گرنگی بەهێزبوونی ئیرادەش، بریتییە لە توانای دەستبەرداربوون.

لەبەر ئەوە باشتر وایە هانی بدەین بۆ پاشەکەوتکردنی پارە، بەڵام نەک بۆ خۆی، بەڵکو بۆ ئەو کەسانەی کە پێویستیان پێیەتی. بەم جۆرە لەبری ئەوەی دڵی ببەسترێتەوە بە ماڵ و سامانەکەیەوە، دڵی وابەستەی ئەو هاوکارییە مرۆییە دەبێت کە پێشکەشی خوشک و برا مرۆڤەکانی دەکات.

هەڵبەتە بەم شێوەیە، توانای دەستبەرداربوونیشی لە شتەکان بەهێزتر دەبێت.

# 39

**(7)ساڵی، تەمەنی ئەسپسوارییە، مامەڵەی منداڵ لەگەڵ ئەسپدا وای لێ دەکات هەست بە بەهێزی بکات**

ئەو دایک و باوکانەی خوازیاری ئەوەن منداڵی بەهێز پێبگەیەنن، پێشنیارمان بۆیان ئەوەیە سوود لە هێزی ئەسپ وەربگرن.

ئەسپسواری تاکە وەرزشێکە لەگەڵ گیانداردا ئەنجام بدرێت، ئاژەڵێک کە لەوپەڕی بەهێزیدایە.

سواربوونی ئەسپ دەرفەتی ئەوەی پێ دەبەخشێت هەست بە هێز و توانای خۆی بکات، چونکە توانیویەتی گیاندارێکی بەهێز ڕامبکات.

ئەمە جگە لەوەی کە توانای چڕکردنەوەی سەرنجی بەهێزتر دەبێت، لەگەڵ ڕۆحی گیانلەبەرێکدا ئاوێتە دەبێت و هێزی لە هەڵمەت و توانستەکەی وەردەگرێت.

لەبەر ئەم هۆیانە، ئەسپسواری بە یەکێک لە ئامرازە گرنگەکانی بەهێزکردنی کەسایەتی دادەنرێت.

(چارەسەر لە ڕێگەی ئەسپەوە)، یەکێکە لە ڕێگە چارەسەرییە سەردەمییەکان، بەتایبەت بۆ ئەو منداڵانەی کە کەسێتییان لاوازە و هەستی متمانەبەخۆبوونیان لەدەست داوە.

# 40

## بیستنی دەنگی کەڵەشێر و دەستهێنان بە بەرخ و کاردا، لە باشترینی چارەسەرەکانە

ئادەمیزاد ئاتاجی سروشتە؛ ئاتاجی بیستنی دەنگی زیندەوەرانی تر و دەستپێداهێنانیانە، ئاتاجی پیاسەکردنە بەناو خۆڵ و لمدا، جا تۆ بڵێ ئاتاجی چی نییە!

بۆ وا نەبێت، مەگەر ئەویش بەشێک نییە لە سروشت! سەقامگیریی ناخیشی بەندە بەوەی چەندێک لەگەڵ سروشتدا دەستلەملانە.

منداڵی سەردەم کە فێری ژیانی ناوشار بووە و بێبەش لە باوەشی سروشت چاوی بە دنیا هەڵهێناوە، زیادەڕەوی ناکەین گەر بڵێین شتی زۆری لەکیس چووە.

هەلی گەڕان بەناو سروشتدا لەگەڵماڵومنداڵ، هەلێکی زێڕینە کە پێویستە کەس لەدەستی خۆی نەدات. گرنگە ئەو زەمینەیە بسازێنین کە منداڵەکانمان گوێیان لە وەڕەی سەگ و باعەی مەڕ بێت و بە چاوی خۆیان کەروێشکەکان ببینن کاتێک هەڵدەقونن.

بێگومان گەشەی سۆزداریی منداڵێک کە دۆستی ژینگە و گیاندارانە، وەک ئەو منداڵە نییە کە لە ژیانیدا گوێی لە قووقەی کەڵەشێر و حیلەی ئەسپێک نەبووە.

# 41

# کرۆکی هەریەک لە ئێمە، **منداڵییەکەیەتی**

تەبایی و هاوئاهەنگیی گەورەسالان لەگەڵ ژیان و کەسانی چواردەوریاندا، لە ڕێگەی ئەو هەستانەوە پێک دێتەوە کە لە سەردەمی منداڵییاندا لەسەر پەڕەی ڕۆحیان نەخشاوە.

لە منداڵیدا چەندە سەربەستانە لەگەڵ هەستەکانمان ژیابین، لە گەورەییدا ئەوەندە دەتوانین کارامەیی ژیانکردن بنوێنین.

کرۆکی مرۆڤ، منداڵییەکەیەتی. ئەو بەشەی تری ژیانیش -تا ڕادەیەکی زۆر- جگە لە ڕەنگدانەوەی ئەو کرۆکە، هیچی دیکە نییە.

جا بۆیە پێگەیشتووەکان چەندە بە ڕێز و ڕەچاوکردنی شکۆی مرۆڤانەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، ئەو ناوکەش ئەوەندە بەرێکی جوان و شیرینی لێ دەردەچێت.

بەڵێ، کرۆکی درەخت، نەمامەکەیەتی.

کرۆکی میوە، ناوکەکەیەتی.

کرۆکی مرۆڤیش، منداڵییەکەیەتی.

# 42

## "ماشەڵڵا هەر دەڵێی کوڕە!"

ئەم دەربڕینە ناهەقییە بەرامبەر کەسێتیی کچان

هەندێك لە دایكان و باوكان، وا دەدەن بە گوێی كچەكانیاندا كە سروشت و هەڵسوكەوتیان لە كوڕان دەچێت.

پێیان خۆشە كچەكانیان وەكو كوڕان بن، بەو ئومێدەی لە كوڕان پارێزراو بن و بەهرە ناوازەكانیان بەدەر بخەن.

لە ڕاستیدا ئەمە كارێكی دروست نییە، چونكە كچ و كوڕ دوو سروشتی جیاوازیان هەیە.

حاڵەتە تەندروستەكە ئەوەیە، هەستەكانی كچان كچانە و هەستەكانی كوڕانیش كوڕانە گەشە بكات.

تۆخكردنەوەی لایەنی كوڕانیی كچان بە هەر هۆیەك بێت، دەبێتە هۆی ئەوەی هەستەكانیان وەكو هەستی كوڕانی لێ بێت. كاریگەریی ئەمەش لە داهاتوودا، لەوەدا دەردەكەوێت كە حەز ناكەن سروشتی خانومانیی خۆیان دەربخەن، ناسكی و نەرمونیانی دەبێتە شتێكی سەیر و نامۆ بۆیان، وا دەزانن ئازایەتی لەوەدایە ڕەق و زبرانە بجووڵێنەوە.

شێواندنی فیترەت و سروشتی ڕەسەن ئەوەیە، ببێتە ڕێگر لەوەی كچەكەت وا هەست بكات كە خانمێكی خانومانە، بەدەر لەوەی ئەمە ناهەقییەكە بەرامبەر ئەو كچانە دەكرێت.

43

# منداڵ پێش ئەوەی هەر شتێک بێت، مرۆڤە، ئینجا منداڵە

لەدوای (٧)ساڵییەوە، منداڵ چەندە هەست بە بوونی خۆی بکات و خەریکی یاریکردن بێت، ئەوەندە خاوەن کەسێتییەکی بەهێزی لێ دەردەچێت.

دانان بە بوونی منداڵدا، بەخشندەییەک نییە گەورەکان بینوێنن، بەڵکو مافی سروشتیی منداڵ خۆیەتی.

چونکە ئەو سەرەتا مرۆڤە، ئینجا منداڵ.

ڕێزگرتنی مرۆڤانە لە مرۆڤ، خەسڵەتێک نییە خۆمانی پێوە هەڵبکێشین، مەگەر مرۆڤ نابێت مرۆڤانە ڕەفتار بکات!

جا مادەم ئەویش مرۆڤە، مافی خۆیەتی پەیوەندییەکی مرۆڤانەی لەگەڵدا ببەستین.

# 44

ئەگەر ڕێز لە منداڵ
بگیرێت، ئەویش فێر
دەبێت ڕێز لە کەسانی
تر بگرێت

ڕێزگرتن لە کەسانی تر، تایبەتمەندییەک نییە لە خۆڕسکەوە تیاماندا بێت، بەڵکو دواتر بەدەستی دەهێنین.

مرۆڤ بەو ئەندازەیەی ڕێزی لێ گیراوە، دەتوانێت ڕێز لە کەسانی تر بگرێت..

کەسێک کە لە منداڵیدا هەستی بە گرنگی و ڕێزی خۆی کردبێت، زۆر چاک لە بایەخی هەستکردنی مرۆڤ بە ڕێزی خۆی تێدەگات.

بەپێچەوانەوە، ئەو منداڵەی تامی ڕێزی خودی نەچەشتووە، نازانێت ڕێزی دەوروبەرەکەشی بگرێت، بگرە بە پێویستیشی نازانێت.

ئەو گەورەساڵەی دەیەوێت منداڵەکەی ڕێزی بگرێت، دەبێت سەرەتا خۆی ڕابهێنێت لەسەر ئەوەی بەڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

45

**"ئا وەرە، بزانم ناوت چییە؟"**

ئەم جۆرە ئاخاوتنە منداڵ نارەحەت دەکات

دواندنی منداڵ بە شێوازی فرمان بەسەردا کردن، هەستی بێدەسەڵاتی لە ناخیدا دەجووڵێنێت.

کاتێک خۆمان بە منداڵ دەناسێنین، گرنگە خاکی بین و مامەڵەمان نەرمونیان بێت.

باشتر وایە ئێمە بچین بۆ لایان، بچەمینەوە تا ئاستی چاویان و بە ڕوویەکی گەشەوە سڵاویان لێ بکەین. پاشان دەتوانین بڵێین: "دەتوانم بتناسم؟"

بانگکردن بە ئاماژەی دەست و دەنگی بەرز و ڕووخساری مۆن، لە نموونەی ئەو ڕەفتارانەن کە دەبنە هۆی ئەوەی منداڵ هەست بە بێنرخیی خۆی بکات.

# 46

## هەڵچوون، هەوڵی لابردنی ئەو کۆسپەیە کە خراوەتە بەردەم ویستی خۆسەلماندن

منداڵ بە یارمەتیی پاڵنەرە ناوەکییەکەی ناخی، هەنگاوبەهەنگاو درێژە بە گەشەی دەدات.

منداڵێکی (٣) ساڵان بایەخ بەو شتانە نادات کە جێی بایەخی منداڵێکی (١٠) ساڵانە. هەروەها منداڵێکی (١٠) ساڵیش بێباکە لەو شتانەی کە بەلای تازەلاوێکەوە گرنگە.

بازنەی پەرۆشی لە سەرەتادا تەسکە، بە تێپەڕبوونی کات فراوان دەبێت.

ڕێگرتن لە فراوانبوونی بازنەی پەرۆشبوون لە هەر قۆناغێکدا بێت، لە قازانجی پرۆسەی گەشەکردن نییە. بەڵام منداڵ بەئاسانی خۆی نادات بەدەستەوە، هەموو هەوڵ و تەقەلای خۆی دەخاتە گەڕ بۆ بەردەوامیدان بە گەشەکەی و لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێی.

بۆ نموونە؛ لە (٤)ساڵی سەرەتای تەمەندا، منداڵ ویستێکی بەگوڕی هەیە بۆ ناسینی شتەکانی دەوروبەری. بۆیە گرتنەوەی لەوەی ئەم ویستەی بەجێ بهێنێت، ڕێگە خۆش دەکات بۆ ئەوەی هەڵسوکەوتی شەڕەنگێزانە بنوێنێت.

ڕێگەگرتن لە منداڵی قوتابخانە بۆ ئەوەی هاوڕێیەتیی کەس نەکات، تووشی دڵتەنگیی دەکات.

حسابنەکردن بۆ هەرزەکار، دەبێتە مایەی تووڕەبوونی.

لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین سەرچاوەی زۆرێک لە ڕەفتارە شەڕەنگێزییەکان، دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگەگرتن لە گەشە نەوەک بێڕێزی نواندن.

# 47

# چارەسەری سەرنجپەرتی بە دەرمان نابێت، بە ڕێکخستنەوەی کەشی خێزانی دەبێت

یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرنجپەرتی لای منداڵان، تێکچوونی شیرازەی خێزانە.

ئەوماڵانەی هاوسەنگیی ژیانی ڕۆژانەیان تێدا دانەمەزراوە، ئەو خێزانانەی دایک و باوکەکەی پێکەوە ناگونجێن، ئەو کەشە سەرکوتکەرانەی کە منداڵ ناتوانێت خۆی تێدا بسەلمێنێت، هەموو ئەوانە دڵ و دەروونی منداڵ دەشێوێنن.

بیر و هۆشیان شپرز دەبێت.

چاکبوونەوەی ئەو جۆرە منداڵانە بە دەرمان نابێت، بەوە دەبێت کەشێکی خێزانی سەقامگیریان بۆ فەراهەم بهێنرێت.

منداڵێک نەتوانێت هۆگری لەگەڵ باوکیدا پەیدا بکات و کاتی خۆش لەگەڵ دایکیدا بەسەر ببات، چۆن چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێت بیروهۆشی لەسەر خۆی بێت!

# 48

## ئەو يارييانە سەرنج بەهێز دەکەن، کە لەگەڵ مرۆڤدا ئەنجام دەدرێن

جاری وایە دایکان و باوکان دەکەونە هەڵەی ئەوەی، کە پێیان وایە منداڵەکەیان بەس حەزی بەوەیە خۆی بە کەلوپەلی یارییەکانیەوە خەریک بکات.

کەچی لە ڕاستیدا منداڵ زیاتر حەزی بەوەیە یاری لەگەڵ مرۆڤدا بکات.

هیچ یارییەک ناگاتەوە بەو یارییەی لەگەڵ باوانیدا دەیکات.

لەبری کڕینی یاریی زیاتر، باشتر وایە ئەو کاتانە زیاد بکەین کە ئێمەش یارییان لەگەڵ دەکەین و کاتی خۆشیان لەگەڵ بەسەر دەبەین.

# 49

# سەرنجی قوتابی، بە ئەندازەی جۆشوخرۆشی مامۆستاکەیەتی

خولیای پشکنین سەرچاوەی وزەی ناوەکییە، خاوەنەکەی زیندە ڕادەگرێت و ئارەزووی فێربوونی تێدا دەبزوێنێت.

ئەوانەی خاوەن پەرۆشبوونن، لە ڕێگەی جۆش و هەیەجانەکەیانەوە پەرۆشبوونی کەسانی تریش دەجوولێنن.

مامۆستا کاتێک دەتوانێت پەرۆشیی قوتابییەکانی بجوولێنێت، کە خۆی دڵی بە ژیان خۆشبێت و نەکەوتبێتە داوی ڕۆتینی کوشندەوە.

بە سەرنجدان لە جۆش و تاسەی مامۆستا، دەتوانین هێزی پەرۆشبوون و ئارەزووی فێربوونی قوتابییەکانی بخەملێنین.

# 50

## ملکەچکردنی منداڵ لە ڕێگەی ترساندنی بە چەمکی خودا و دۆزەخ، قۆستنەوەیەکی نەخوازراوی ئایینە

قۆستنەوە بریتییە لە بەکارهێنانی شتێک وەکو ئامراز، بە نیازی گەیشتن بە مەرامێکی دیاریکراو.

بەکارهێنانی چەمکە ئایینییەکان بە ئاراستەیەک کە ملکەچی و گوێڕایەڵیی منداڵەکەت بۆ دەستەبەر بکات، بە جۆرێک لە خراپ بەکارهێنانی ئایین لەقەڵەم دەدرێت.

گەورەساڵی وا هەیە، لەپای چەسپاندنی خوویەکی دیاریکراو لە منداڵەکەیدا، ناسڵەمێتەوە لەوەی ئایین بکاتە ئامرازی چاوترساندن. ئەمە لە کاتێکدا ئایین تەرزی ژیانە، نەوەک ئامرازی چاوترساندن.

گرنگە ئایین بەو چەشنە بخرێتە پێش چاوی منداڵانی قوتابخانە، کە سەرچاوەی ئاسوودەیی و ئاسایش و دڵنیاییە، بەڵکو لە سایەی ئەم باوەڕەیەوە ئارامی بێت بە دڵیاندا و هەست بە باشی بکەن.

باوەڕ مایەی ئارامی و ئاسوودەیی دەروونە، ئامرازی لەقاڵبدانی هەڵسوکەوت و ڕەفتار نییە.

# 51

# منداڵ لە ڕێی دیکۆرەوە فێری ڕێکخستن دەبێت

بابەتی ڕێکدانان و ڕێکخستن، یەکێکە لەو بابەتانەی کە بەردەوام جێی ناکۆکی و مشتومڕی نێوان دایک و باوک و منداڵانە.

منداڵ حەزی لە بێنەوبردەی ڕێکدانان و ڕێکخستن نییە، لەبەر ئەوە بەلایەوە سەیرە کە پێی دەوترێت ژوورەکەت کۆ بکەرەوە.

منداڵی قوتابخانە زیاتر حەزیان بە کاری وردە، تاوەکو ڕێکدانان و ڕێکخستن.

بەگەڕخستنی ئەم حەزەش بەوە دەبێت، کاروباری ژوورەکەی بدەیتە دەست خۆی و ڕێی بدەی خۆی دیکۆرەکەی ڕێک بخات.

دانانی لامپێک لەسەر مێزەکەی. هەڵواسینی تابلۆیەک لەپەنا سەریەوە...

کاریگەریی ئەوەی بە منداڵێکی (٧) ساڵانە بڵێی: "بە حەزی خۆت دیزاینی ژوورەکەت بکە." زۆر لەوە زیاترە پێی بڵێی: "ئا ڕۆڵە دەستێک بێنە بەو ژوورەتدا!"

# 52

# منداڵان بە خەمساردیی گەورەکان بێزار دەبن

هەندێک جار گەورەساڵان لەلای منداڵدا، تا ڕادەیەک خەمساردانە ڕەفتار دەکەن.

بۆ نموونە؛ لە کاتی دانیشتندا بە دڵی خۆیان قاچیان بڵاو دەکەنەوە، هەر قسەیەک بە خەیاڵیاندا بێت، دەیکەن و بە دەنگی بەرز قاقا لێ دەدەن.

ئەم جۆرە لە خەمساردی لە ڕەفتاری گەورەکاندا، دەبێتە مایەی خۆبەکەمزانی و بێزاری لای منداڵ.

کاتێک ئەندامانی خێزان پێکەوە لەسەر خوانی ئێوارەن، منداڵ هەست بە تەریقی دەکات کە دەبینێت باوکی ملّچەی دەمی دێت، یان دایکی پانتاییەکی فراوانی داگیر کردووە لە دانیشتنیدا.

"ماڵی خۆم نییە؟ چۆنم بوێت ئاوەها دەکەم!" پێچەوانەی بنەمای پێکەوەژیانە.

پێویستە منداڵ مامەڵەی جوان لە باوانی ببینێت. خۆی چۆن ڕێز لە مافی میوان و کەسانی نەناسراو دەگرێت، دەبێت هەست بکات کە خۆیشی بەو جۆرە ڕێزی لێ دەگیرێت.

53

هەر کەسێک
لەلای منداڵ
کەسێتیی نەمێنێت،
کاریگەریشی
نامێنێت

بەها و کاریگەریی هەر وتەیەک، لەسەر پێگە و کەسێتیی خاوەنەکەی وەستاوە.

هەر دایکێک/باوکێک هەستی کرد منداڵەکەی بەقسەی ناکات، یەکەم شت پێی هەستێت ئەوەیە، لە چۆنایەتیی پەیوەندیی نێوان خۆی و منداڵەکەی بکۆڵێتەوە.

منداڵ گوێڕایەڵی دایک و باوکێک دەکات کە:

متمانەی پێیان بێت.

دادگەری ببینێت لە مامەڵەیاندا.

بووبێتنە پەناگەی ئارامی و ئاسایش بۆی.

ئەوانەش کە توندوتیژی دەنوێنن و دادپەروەر نین لە مامەڵەیاندا و متمانەی ڕۆڵەکانیان بەدەست نەهێناوە، لە چاوی منداڵەکانیاندا پێگەی شایستەی خۆیان وەکو دایک و باوک لەدەست داوە.

هەر دایکێک یان باوکێک کەسێتی و پێگەی لە چاوی منداڵەکەیدا بلەرزێت، کاریگەریشی نامێنێت.

# 54

## ”که له ته‌مه‌نی تۆدا بووم...“

## نموونه‌ی شێوازێکی ناته‌ندروستی ئاخاوتنه له‌گه‌ڵ منداڵ

زۆرێک لە دایکان و باوکان بە نیازی ئەوەی نموونەیەکی جوان نیشانی منداڵەکەیان بدەن، بە چەشنێک ئەزموونی منداڵیی خۆیان دەخەنە ڕوو، وەک ئەوەی هیچ کەموکورتییەکیان نەبووبێت. تومەز لەو ڕێیەوە دەیانەوێت چییان لە منداڵەکەیاندا بەدڵ نییە، بیدەنە بەر ڕەخنە.

گوایە بەم شێوازە توانایان دەجووڵێنن و ورەیان دەدەنە بەر.

لە ڕاستیدا ئەمە شێوازێکی پەروەردەیی نییە.

ئەو دایکەی/باوکەی سەرگوزشتەی (کامڵ و بێخەوش)ی خۆی کردووەتە ئامرازی هاندان، ڕەنگە نەزانێت خودی خۆی کردووەتە ئامرازێک بۆ بچووککردنەوەی منداڵەکەی.

بنەمایەکی گرنگی ئاخاوتن لەگەڵ منداڵ، بەئاسایی نیشاندانی ئەو دۆخەیە کە منداڵەکەی تێدایە. لەبری ئەوەی بوترێت: "من کە لە تەمەنی تۆدا بووم..." باشتر وایە بوترێت: "منیش کە لە تەمەنی تۆدا بووم..."

"منیش کە لە تەمەنی تۆدا بووم، کتێب خوێندنەوەم بەلاوە قورس بوو."

"منیش لەو تەمەنەدا چەند سفرێکم تێدا بوو."

"منیش کە لە تەمەنی تۆدا بووم، شەوان دەترسام."

ئەمانە شێوازی دروستی ئاخاوتنن لەگەڵ منداڵ.

55

مندااڵ کە هەڵەی کرد،
پێویستی بەوەیە
ڕەفتارە دروستەکەی
فێر بکرێت، نەوەک
تەریق بکرێتەوە

بەشێک لە گەورەساڵان پێیان وایە ئەگەر منداڵەکەیان هەڵەیەکی کرد و ئەمان تەریقیان کردەوە لەسەری، ئیتر بەو شێوەیە فێری ڕەفتارە دروستەکە دەبێت.

تانەوتەشەر شێوازی فێرکاری نین، تاوەکو کاریگەریی ئەرێنییان لەسەر منداڵ هەبێت.

منداڵ بەوە فێری سەلیقە دەبێت کە ئاشنای ڕەفتارە دروستەکان بێت، نەوەک بەوەی لەسەر هەڵەکانی ڕووشکێن بکرێت و توانجی لێ بدرێت.

تەریقکردنەوە یەکێکە لەو هەڵە باوانەی، کە گەورەساڵان لە مامەڵەیان لەگەڵ منداڵدا تێی دەکەون.

بۆ نموونە؛ لەبری ئەوەی بوترێت: "بەمڵچەمڵچ نان مەخۆ!" باشتر وایە بوترێت: "ئەگەر پارووەکەی ناو دەممان بەم شێوەیە (بەکردەنی نیشانی دەدرێت) بجوین، ئاسانتر هەرس دەبێت." ئەم شێوازە هەم منداڵەکە ڕووشکێن ناکات، هەم یارمەتیشی دەدات فێری ڕەفتارە دروستەکە ببێت.

# 56

## زیادبوونی شتومەکی منداڵ
## بە شێوەیەکی هەڕەمەکی،
## کاریگەریی نەرێنیی هەیە
## لەسەر پەیوەندیی نێوان
## منداڵ و باوان

بۆچوونێکی باو هەیە دەڵێت، گوایە منداڵ چەندە شتومەکی زیاتر بێت، گەشەی ئەوەندە باشتر دەبێت، بەڵام هیچ توێژینەوەیەکی زانستی ئەم بۆچوونە پشتڕاست ناکاتەوە.

بگرە بەپێچەوانەوە، لەگەڵ زیادبوونی کەلوپەل و شتومەکدا، (سەرنجپەرتی)یش زیاد دەکات.

زیاد لەوە، لە منداڵانی قوتابخانەدا تا کەلوپەل زیاتر بێت، پەیوەندیی سۆزداریی نێوان باوان-منداڵ لاوازتر دەبێت.

لەبەر ئەوە باشبوونی باری دارایی خێزان، نابێت هۆکار بێت بۆ زیادبوونی شتومەکی منداڵ.

چونکە گەشەی سۆزداریی منداڵ لەسەر زۆریی ژمارەی یاری و کەلوپەلەکانی نەوەستاوە، لەسەر ئەوە وەستاوە تا چ ڕادەیەک پێویستییەکانی پڕ دەکرێتەوە.

# 57

# منداڵ لە سەرگوزەشتەی منداڵیی باوانیدا، خۆی دەبینێتەوە

یەکێک لەو شتانەی کە منداڵی قوتابخانە ئامەزرۆی زانینیەتی، چیرۆک و سەرگوزەشتەی منداڵیی دایک و باوکیەتی.

بیستنی ئەو بەسەرهاتانە، پێیەکانیان لە زەوی دەبڕێت و دەیانخاتە کەشێکی بێهاوتاوە، جگە لەوەی ڕۆڵێکی مەزنیش دەگێڕێت لە دروستکردنی کەسایەتییاندا.

لەبەر ئەوە دەمەوێت جەخت بکەمەوە سەر ئەوەی، کە چەندە گرنگە دایک و باوکان زوو زوو بەسەرهات و یادەوەرییەکانی منداڵیی خۆیان -بە کەمێک تاموچێژەوە- بۆ جگەرگۆشەکانیان بگێڕنەوە، چونکە ئەمە پەیوەندییەکەی نێوانیان بەهێزتر دەکات، هەروەک چۆن دنیایەک وانەشی تێدایە منداڵ لێیانەوە فێر بێت.

زۆرێک لە باوان لەبری گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی منداڵیی خۆیان، دەچن کۆمەڵە کتێبێکی چیرۆک بەوشکوبرنگی دەخەنە بەر دەست منداڵەکانیان.

ئەمە لە کاتێکدا ئەو چیرۆکەی کە پێویستە هەموو منداڵێک گوێبیستی بێت، چیرۆکی منداڵیی دایک و باوکیەتی.

## 58

خۆشترین قسە کە منداڵ
لە باوانیەوە بیبیستێت،
ئەم قسەیەیە:
**"با تۆ منیشت خۆش**
**نەوێت، من هەر تۆم**
**خۆش دەوێت"**

گرنگترین توخمی گەشەی کەسێتی، بریتییە لە بێمەرجی.
بێمەرجی واتە تەنیا لەبەر ئەوە منداڵەکەت خۆش بوێت، کە (ئەو)ە و تەواو.

نەک لەبەر ئەوەی نانەکەی خواردووە، یان ژوورەکەی کۆکردووەتەوە.

نەک لەبەر ئەوەی بەقسەی کردووی، یان نمرەی بەرزی هێناوە.

ئەو منداڵەی بە کۆکردنەوەی ژوورەکەی خۆشەویستیی بۆ دەردەبڕدرێت، وا بیر دەکاتەوە ئەگەر ژوورەکەی کۆ نەکاتەوە، خۆشیان ناوێت.

ئەو منداڵەی تەنیا لە کاتی نمرەی بەرزدا هەست دەکات دڵیان پێی خۆشە و خۆشەویستە، تا بێت لە ڕووی سۆزدارییەوە لە دایک و باوکی دوور دەکەوێتەوە، چونکە پێی وایە دوو بوونەوەری بەرژەوەندیخوازن.

ئەو منداڵانەی لەسەر مەرجداری ڕاهێنراون، تووشی چەندین نارەحەتی دەبن لە بەرەوپێشبردنی خۆیاندا. جا پێم ناڵێن ئەنجامدانی چەند ڕەفتار و هەڵسوکەوتێک، لەچاو زیانەکانیدا، چ بەهایەکی بۆ دەمێنێتەوە!

لەبەر ئەوە دەڵێم شیرینترین قسە لە ژیانی هەر منداڵێکدا ئەوەیە، گوێیەکانی بەم وشانە بزرنگێنەوە: "کچی خۆم/کوڕی خۆم، نە لەبەر ئەوە و نە لەبەر ئەمە تۆم خۆش دەوێت، تەنیا لەبەر ئەوە خۆشم دەوێی کە تۆ، تۆیت."

# 59

ئەو منداڵەی (لە
کاتی خۆیدا) و (وەکو
پێویست) بەدەمیەوە
نەچوون، بە منداڵێکی
فەرامۆشکراو
دادەنرێت

کە باس لە منداڵی فەرامۆشکراو دەکرێت، دەستبەجێ منداڵانی سەرشەقامان دێتە بەرچاو، هەڵبەتە هەر ئەوان نین کە فەرامۆش کراون.

ڕاستە، ڕێژەی ئەو منداڵانەی خراونەتە سەر شەقامەکان و پەراوێز خراون، ڕێژەیەکی ئێجگار بەرزە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ڕێژەی ئەو منداڵانە زیاترە، کە لەناو خێزانی خۆیاندا فەرامۆش کراون.

ئەو منداڵەی دەستی ناگات بە دایکی و ناتوانێت سەرنجی ئەو بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ ئەو منداڵەی دایکی نەماوە.

ئازاری ئەو منداڵەی باوکی یاریی لەگەڵ ناکات، هیچی کەمتر نییە لە ئازاری منداڵێکی فەرامۆشکراو.

ئەو منداڵەی لەتاو ترسی شەوان پەنا دەباتە بەر باوانی بۆ ئەوەی دڵی بدەنەوە، کاتێک پێی دەوترێت: "ئێمە لێرەین، هیچ شتێک نییە لێی بترسیت، دەی بچۆرەوە ژوورەکەی خۆت!" لە ناخی خۆیدا هەست بە بێکەسی دەکات.

ئەی ئەو منداڵەی کە لەپاش ماندووێتیی ئەنجامدانی ئەرکی قوتابخانە دەیەوێت باوەشێک بکات بە دایکیدا، بەڵام دایکی پێی دەڵێت: "ئەرکەکانی قوتابخانەت تەواو بکە، ئینجا باوەشم پێدا بکە!" چۆن هەست بە ڕەتکرانەوە و بۆشایی سۆزداری نەکات!

هەر هەڵسوکەوتێک پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی منداڵی تێدا ڕەچاو نەکرێت، دەچێتە خانەی فەرامۆشکردنەوە و منداڵ دووچاری بۆشایی سۆزداری دەکات.

# 60

## ئەو دایک و باوکانە قسەیان ڕۆڵی دەبێت، کە کاریگەرییان هەیە

خۆسەپاندن حاڵەتێکە، جیاوازە لەوەی کاریگەریت هەبێت.

خۆسەپاندن واتە چیت بوێت، بە زەبری هێز بە بەرامبەرەکەتی دەکەیت.

بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە تۆ کەسێکی خاوەن کاریگەریت.

کەسانی کاریگەر دەوروبەرەکەیان گوێیان بۆ دەگرێت و قسەکانیان بەهەند وەردەگرێت، بەبێ ئەوەی ئەمان هێزی بازوویان دەربخەن یان بەزۆر خۆیان بسەپێنن.

هاوسەنگی و مامەڵەی ئاوێتە لە ڕێز و خۆشەویستی، لەو هۆکارانەن کە کاریگەریی دەبەخشن بە کەسێتیی دایک و باوک.

61

هەموو دایک و باوکێک
منداڵی خۆی خۆش
دەوێت، بەڵام کەمێکیان
منداڵەکانیان دەبینن و
هەستیان پێ دەکەن

بەشێک لەو گەورەساڵانەی ئەزموونی منداڵییان بە دۆخێکی ناهەمواردا تێپەڕیوە، بۆ ئەوەی جارێکی تر هەست بە ئازار نەکەنەوە، هەندێک تایبەتمەندییان لە خۆیاندا سڕ کردووە.

ئەو جۆرە کەسانە بێباکن لە هەستەکانیان، چونکە دەیانەوێت بەهێز بن لە ژیاندا.

کاتێک دەبن بە دایک و باوک، وەک هەر دایک و باوکێکی ئاسایی دیکە، ئەوانیش منداڵەکانیان خۆش دەوێت، گرفتەکە لەوەدایە ڕەنگە وەک پێویست هەستیان پێ نەکەن و نەتوانن لە دنیای ناخیان نزیک ببنەوە.

زۆرێک لەوانەی پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ هەستەکانیان پچڕاندووە و نایانەوێت گوێ لە ناخیان بگرن، دوور نییە بێبەش ببن لە هەندێک بەهرەی دایکایەتی و باوکایەتیش.

چەندە دوور بین لە هەستکردن بە ڕۆڵەکانمان، ئەوەندەش پەیوەندیمان لەگەڵیان لاواز دەبێت.

62

توانای (هەستپێکردن)، لە گرنگترین ئەو توانایانەیە کە پێویستە لە منداڵەکانماندا بیپارێزین

منداڵ لە سەرەتادا بە هەستەکانییەوە دەژی،

بە ئەندازەی هەستکردنی، لە جۆش و خرۆشدا دەژی،

لەدەستدانی هەستەکانی، واتە لەدەستدانی وزە و حەزی ژیانی،

گوشار خستنە سەر، زۆرلێکردن، ڕووشکێنکردن، هاوار بەسەردا کردن، توندوتیژی، هەموو ئەمانە هۆکارن بۆ لەناوبردنی هەستەکانی،

ئەگەر دایکان و باوکان دەیانەوێت چاکەیەک لەگەڵ منداڵەکانیاندا بکەن، ئەوا با نەهێڵن توانای هەستکردنیان زیانی بەر بکەوێت، ئەمەش بەوە دەبێت تەریقیان نەکەینەوە، سزایان نەدەین، نەبینە هۆکاری ئەوەی هەست بە خەتاباری خۆیان بکەن،

# 63

ئەو منداڵانەی لە
قوتابخانە تەمێ کراون،
کە دێنە ماڵەوە، بزێو و
لاسار دەبن

یەکێک لە هەستە سەنگینەکانی ناخی مرۆڤ، بریتییە لە هەستی شەرم و حەیا.

ئەو منداڵانەی لەناو پۆلدا لەبەر چاوی هاوڕێکانیان سزا دەدرێن و تەریق دەکرێنەوە، لەتاو بارگرانیی ئەو هەستە ناخۆشانە، بەملاولادا ڕادەکەن و جووڵەی بێمانا دەنوێنن.

لە ڕاستیدا ئەمە جۆرێکە لە (خۆپارێزی)، کە منداڵان وەک میکانیزمێک بۆ هەستنەکردن بە ئازاری لەکەداربوونی شکۆیان، دەیگرنە بەر.

فێرکاری سەرکەوتوو لەبەرامبەر ڕەفتاری چەوتی قوتابییەکەیدا، ڕێگەی سزا و تەمێکردن ناگرێتە بەر، چونکە دەزانێت ئەم شێوازە جگە لە قووڵکردنەوەی گرفتەکە، هیچ بەرهەمێکی تری نییە. لەجیاتی ئەوە دەچێت ڕێگە دروستەکە هەڵدەبژێرێت، کە ئەویش نرخپێدان و بە گرنگزانینی قوتابییەکەیەتی.

بە سنگێکی فراوانەوە مامەڵە لەگەڵ هەڵە دەکات و پەیوەندییەکی مرۆڤانە بنیاد دەنێت.

کاریگەری دادەنێت لەسەر بەرامبەرەکەی، خۆی فەرز ناکات.

دەشزانێت ڕاستکردنەوەی هەڵسوکەوت و ڕەفتار پێویستی بە کاتە، بۆیە هێمنی و ئارامیی کردووەتە کاڵای باڵای خۆی.

”

# 64

## ڕێنەدان بە منداڵ کە بگریەت، بەهێزی ناکات، بێگانەی دەکات بەرامبەر هەستەکانی

ڕووبەڕووبوونەوە زۆرێک لە گەورەکان خۆیان لە گریانی منداڵ ئاسێدەدەن بۆ ئەوەی بێدەنگی بکەن، فشار بەکار دەهێنن.

گریان یەکێکە لە پێویستییەکانی مرۆڤ.

ڕێگرتن لە منداڵ بۆ ئەوەی ئەم پێویستییەی پڕ نەکاتەوە، بەهێزی ناکات، بەپێچەوانەوە، دەبێتە مایەی لاوازبوونی.

ئەو جۆرە منداڵانە یان ئەوەندە بزێو دەردەچن کە گوێ بە هیچ سنوورێک نادەن، یان لە بێدەسەڵاتیدا تەنانەت داوای مافی خۆیشیان ناکەن.

ئەو منداڵەی ڕێگەی پێ نادرێت بگریەت، دوا جار توانای گریانی نامێنێت، بە شێوەیەك کە تەنانەت لە گەورەییشدا ناتوانێت ئەم پێویستییەی پڕ بکاتەوە، چونکە گریان بە نیشانەی لاوازی دەبینێت و ئەو کەسانەشی پێ لاوازە کە دەگرین.

ئەوتوویی نییە نەتوانێت بگریەت، کەمتوانایە.

گریان نیشانەی لاوازی نییە، بەڵکو نیشانەیەکە بۆ زیندوویەتی و کارایی هەستەکان.

مرۆڤ بە هێندەی توانای گریانی، دەتوانێت لە دەوروبەر و ئازاری تێبگات.

65

ئەو منداڵانەی
لەسەر هەستەکانیان
لێپرسینەوەیان لەگەڵ
دەکرێت، سەرکز، لە
هەندێ باریشدا شەڕەنگێز
هەڵدەکەون

دایکان و باوکان حەز دەکەن بزانن، منداڵەکانیان لە قوتابخانە و لە کۆڵان خەریکی چین.

هەر ئەوەندەی لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە، دەستبەجێ بە زنجیرەیەک پرسیار ڕووبەڕووی دەبنەوە: "ئەمڕۆ چیت کرد؟ چی ڕووی دا؟ لەگەڵ کێ یاریت کرد؟ لە فرۆشگەی قوتابخانە چیت کڕی؟" و... هتد. فێر بوون بەو جۆرە گرنگیپێدانی خۆیان دەربڕن.

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە پرسیارانە کە شێوەی لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوەیان هەیە، پاش ماوەیەک وا لە منداڵەکە دەکات کاردانەوەی هەبێت و وەڵامی هیچ پرسیارێکیان نەداتەوە و هیچیان بۆ نەگێڕێتەوە.

کە تۆ لێی دەپرسیت: "ئەمڕۆ چیت کرد؟"، ئەو تاقەتی گێڕانەوەی نامێنێت.

ئەگەر دەتانەوێت بزانن منداڵەکەتان لەدەرەوە چیی کردووە و ڕۆژەکەی چۆن بەسەر بردووە، پێویستە یەکەم جار ئێوە خۆتان دەست بکەن بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ڕۆژەکەتان.

ئەو دایک و باوکانەی شتی خۆیان بۆ منداڵەکەیان دەگێڕنەوە، ڕێگەی بۆ خۆش دەکەن ئەویش شتی خۆی بۆ ئەوان بگێڕێتەوە.

66

ئەو دایک و باوکانەی
دڵەڕاوکەیان هەیە،
منداڵەکانیان ترسنۆک
دەردەچن

”

دڵەڕاوکە تایبەتمەندییەکی هەیە، ئەویش ئەوەیە لە ڕووی دەروونییەوە دەگوازرێتەوە.

واتە، دڵەڕاوکەی دایك و باوك بەئاسانی دەگوازرێتەوە بۆ منداڵەکان.

منداڵیش کە نەیزانی چۆن زاڵ بێت بەسەر دڵەڕاوکەکانیدا، ئیتر بۆخۆی ترسنۆک دەردەچێت.

ئەو منداڵانەی بەردەوام هۆشیارییان دەدرێتێ لە ترسی ئەوەی نەبادا شتێکی خراپیان بەسەردا بێت، هەروەها ئەوانەی چاوترسێن دەکرێن بەوەی کە "لەم دنیایەدا کەس جێی متمانە نییە!"، ئەمانە ناتوانن بە جۆش و تامەزرۆییەوە بژین.

بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین ئەو منداڵانەی سەرکز و ترسنۆکن، منداڵی دایک و باوکانێکی سەرکوتکەر یان پڕ لە دڵەڕاوکەن.

“

## 67

ئەو منداڵانەی
هەستەکانیان لەژێر
چاودێریدایە، گریان
و پێکەنینیان بەدڵی
خۆیان نییە

گریان و پێکەنین، لە هەرە پێداویستییە سۆزدارییەکانی مرۆڤن.

پڕبوونەوەی ئەم دوو پێداویستییەش، بەندە بەوەی تا چ ئاستێک بەسەربەستی ئەزموونیان دەکەیت.

مرۆڤ هەتاکو بگریەت، لە هەستەکانیدا قووڵتر دەبێتەوە، چەندێکیش بتوانێت لە دڵەوە پێبکەنێت، ئەوەندە دەروونی بەرین دەبێت.

ئەو منداڵەی کە لە ناخی دڵیەوە پێکەنینی دێت و دایک و باوکی دەهێڵن پێبکەنێت، یان کە دەیەوێت پڕبەدڵ بگریەت (جا بۆ هەرشتێک بێت، با بەلای ئێمەشەوە بێمانا بێت)، ڕێی لێ ناگرن بگریەت، لە گەورەییدا دەزانێت کوێ جێی گریانە و کوێ جێی پێکەنینە.

ئەگەر کەسێکت بینی کە دەیتوانی لە ناخی دڵیەوە بزە بکات و لە شوێنی خۆیشیدا پڕ بەدڵ بگریەت، ئەوا بزانە منداڵییەکی تەندروستی بەڕێ کردووە.

68

ئازایەتی لەوەدا نییە داهاتوویان بۆ ئامادە بکەین، ئازایەتی لەوەدایە ئەوان بۆ داهاتوو ئامادە بکەین

کێ گومانی هەیە لەو ڕەنج و شەونخونییەی، کە دایک و باوکان لەپێناو کامەرانیی ڕۆڵەکانیاندا دەیکێشن!

هەموو قوربانییەک دەدەن بۆ ئەوەی داهاتوویەکی شکۆمەندیان بۆ ئامادە بکەن، لەبەر ئەوان خۆیان لە زۆرێک لە پێویستی و خۆشییەکانی ژیان بێبەش دەکەن.

کەچی لە ڕاستیدا منداڵ کاتێک لە ژیاندا سەرکەوتوو دەبێت، کە لە ئامێزی دایک و باوکێکی لێزاندا ئامادە بکرێت بۆ داهاتوو، نەوەک ئەوەی داهاتووی بەئامادەکراوی بخرێتە بەر دەست.

بەنرخترین میراتی ئێمە بۆ منداڵەکانمان ئەوەیە، فێری کارامەیی (دروست خوێندنەوەی ژیان)یان بکەین.

69

جوانترین خەسڵەتی
پەروەرشیار
ئەوەیە، لێوبەخەندە
بێت بەرامبەر
قوتابییەکانی

”

ڕەنگە وا بزانین زەردەخەنە ڕەفتارێکی زۆر سادە و ساکارە. کەچی خۆی لە ڕاستیدا یەکێکە لە بەرزترین و جوانترین خەسڵەتە مرۆییەکان.

زەردەخەنە، تایبەتمەندیی ئەو کەسانەیە کە توانای زاڵبوونیان هەیە بەسەر خۆیاندا، هێمای بەرەنگاربوونەوەیە بەرامبەر سەختییەکانی ژیان.

ئەگەر مامۆستایەک سەرباری هەڵسوکەوتی منداڵانەی قوتابییەکانی، هێشتا توانیی بزەی سەر لێوی بپارێزێت، بزانە ئەوە مامۆستایەکە کە توانای بەڕێوەبردنی هەستەکانی هەیە.

لەبەرامبەردا، ئەو مامۆستایەی کۆنترۆڵی هەستەکانی لەدەست خۆیدا نییە، کەسێکی پڕدڵەڕاوکە و تووڕەیە، بەلام چووە ناوی لێ ناوە (یاسا و ڕێسای ناوپۆل).

قۆناغی منداڵی، تەمەنی پلیشانەوە نییە لەژێر باری یاسا و ڕێسادا، تەمەنێکە پێویستە لەگەڵ گەورەساڵێکی لێوبەخەندەدا بە دڵخۆشی و ئاسوودەیی بەسەری ببات.

“

## 70

### شەکەتیی سۆزداری، هۆکارێکە ناهێڵێت منداڵ هەست بە بوونی خۆی بکات

یاسایەکی بنەڕەتییە کە منداڵ چەندە پڕ بێت لە وزەی ژیان و دڵخۆش بێت، ئەوەندە هەست بە بوونی خۆی دەکات، هەستەکانی دەردەبڕێت، گوزارشت لە بیروبۆچوونەکانی دەکات و هاوڕێیەتی دروست دەکات.

بەپێچەوانەوە، چەندە بێهیوا بێت، ئەوەندە لە ژیان بێزار دەبێت.

بیرکردنەوە لەوەی کە ناتوانێت لە وانەکانیدا دەربچێت یان بەسەرکەوتوویی قوتابخانە تەواو بکات، دووچاری شەکەتیی سۆزداریی دەکات.

جوانترین دیاریی گەورەساڵێک بۆ منداڵ ئەوەیە، ببێتە مایەی ئومێد و سەرچاوەی هیوا بۆی.

71

منداڵان هەر وا ئاسان
تووشی شەکەتیی
سۆزداری نابن، بەڵام
کە تووشبوون، بە
زەحمەت لێی دێنە
دەرەوە

دیارترین سیمای منداڵی، ئەو حەز و وزە زۆرەیە کە منداڵان هەیانە بۆ ژیان.

هەر ئەم حەزەشە وا دەکات، هەست بە بوونی خۆیان بکەن.

ئەوان توانای ئەوەیان هەیە (دوێنێ)کەیان بخەنە لاوە و بیر لە ناخۆشی و گوشارەکانی نەکەنەوە، لە هەمان کاتدا چێژ لە تاسە و خۆشیی (سبەینێ)کەشیان وەربگرن، سەرباری هەموو شتێک.

لەبەر ئەوە منداڵان بەراورد بە گەورەساڵان، درەنگتر بێتاقەتی ڕوویان تێ دەکات و بێهیوایی لە ژیان بەرۆکیان دەگرێت.

گرفتەکە لەوێوە دەست پێ دەکات کە منداڵ بکەوێتە ناو ئەم حاڵەتەوە، چونکە سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی وزە و چێژی ژیان بۆ منداڵ، کارێکی هەر وا ئاسان نییە.

هۆکاری ئەوەی منداڵ لە ناخیدا تووشی تێکشکاوی ببێت و هەست بە شەکەتیی سۆزداری بکات، بێهیواییە، ئەوەیە کە هەنگاو دوای هەنگاو بۆی دەربکەوێت ئەو شتانەی کە ئەو ئومێدی دەکردن، نایەنە دی.

کەواتە ئەوەی دەکەوێتە سەرشانی گەورەساڵان، ئەوەیە کارێک نەکەن منداڵەکانیان تووشی نائومێدی ببن و ترووسکایی هیوایان خامۆش ببێت.

”

که باس لـه توندوتیژی دەکرێت، گەورەساڵان ڕاستەوخۆ خەیاڵیـان دەچێت بەلای توندوتیژیی جەستەییدا.
کەچـی خۆی لـە بنەڕەتـدا، لەنـاو جۆرەکانـی توندوتیژیدا، قورسترینیان (توندوتیژیی سـۆزداری)یە".

لە ڕاستیدا ئەوە ئازاری لێدان نییـە کە منداڵ دەخاتە گریان، بەڵکـو ئـازاری دەروونیی ئەو سـووکایەتی و شکاندنەوەیە کە لـە کاتـی ڕووبەڕووبوونـەوەی توندوتیژییەکـەدا هەسـتی پـێ دەکات.

“

## 73

کوڕان لە ڕێی
بەکارهێنانی جزدان
و کچانیش لە ڕێی
بەکارهێنانی جانتاوە
فێری ڕێکخستن
دەبن

زۆرێک لەو منداڵە کوڕانەی لە قۆناغە جیاوازەکانی خوێندندان، حەزیان لە هەڵگرتنی جزدان و لەچاوکردنی چاویلکەیە.

کچانیش حەزیان لێیە هاوشێوەی دایکیان، جانتایان بە دەستەوە بێت.

ئەم قۆناغە دەرفەتێکی زێڕینە بۆ ئەو دایک و باوکانەی خوازیارن منداڵەکانیان فێری خووی ڕێککاری و ڕێکخستن بکەن.

لەبەر ئەوە کاتێك کیژێک داوای جانتا دەکات، یان کوڕێک دەڵێت حەزم لێیە جزدان بەکار بهێنم، باشتر وایە وەڵامی داواکەیان بدەینەوە.

دەکرێت کچان فێر بکرێن کلینکس و بۆن و یارییەکیش کە خۆی حەزی لێیەتی، لە جانتاکانیاندا دابنێن.

دەکرێت کوڕانیش پێشنیاری ئەوەیان بۆ بکرێت، چەند کارتێک و بڕێک پارەی کاغەز بخەنە ناو جزدانەکانیانەوە.

کاتێك منداڵ کەلوپەلی گەورەکان بەکار دەهێنێت، هەستێکی خۆشی لەلا دروست دەبێت، ئەمە جگە لەوەی هەنگاوێکی گرنگیش دەنێت بەرەو ڕێککاری و ڕێکخستن لە ژیانیدا.

بەکارهێنانی تەلەفزیۆن بە شێوەیەکی دروست، لەوانەیە کۆمەڵە قازانجێکی هەبێت بۆ ئەو منداڵانەی لە قوتابخانەن.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک بە شێوەیەکی بێبەرنامە بەکار دێت، منداڵ تووشی کۆمەڵێک گرفت دەکاتەوە، لەوانە: پشێویی کۆنترۆڵکردنی هەڵچوونەکان، پشێویی پڕجووڵەیی، تێکچوونی مەزاج.

شەپۆلە دەنگی و ڕەنگییە چڕەکان، هاوکات لەگەڵ ئەفێکتە (کاریگەرییە) بینراوەکان، هەموو ئەوانە هەڵچوونە کۆنترۆڵنەکراوەکانی دەروونی منداڵ دەورووژێنن. بۆ منداڵێک کە لەژێر کاریگەریی ئەو شەپۆلانەدایە، ئەستەمە بتوانێت هەڵچوونەکانی پێ کۆنترۆڵ بکرێت.

ئەو بەخێوکارانەی لە ڕەفتاری پڕجووڵەی منداڵەکانیان بێزارن، دەبێت سەرەتا چاوێک بخشێننەوە بە شێوازی بەکارهێنانی تەلەفزیۆن لەماڵەکانیاندا.

# 75

# (لێرەدا-لە ئێستادا)
# مەرجی
# پەیوەندییەستنی
# بەرهەمدارە

بەشێک لە دایک و باوکان پێیان وایە، بەسەربردنی (کاتی بەرهەمدار) لەگەڵ منداڵ، بەوە دەبێت لەگەڵ خۆیدا بیبەیت بۆ شانۆ و تەماشاکردنی چالاکیی وەرزشی و ئەو بابەتانە.

بەشێکی دیکەش پێیان وایە، ئەو کاتەی کە باوان ئامۆژگاریی منداڵەکەیانی تێدا دەکەن، خودی ئەو کاتە بەرهەمدارەیە کە ئێمە باسی دەکەین.

بەدەر لە هەموو ئەوانەی وتران، پەیوەندیی جۆری، ناونیشانی ئەو پەیوەندییەیە کە لە (ئێستادا) و لە ساتەوەختەکەی خۆیدا بەڕێوە دەچێت.

تایبەتمەندیی ئەم جۆرە پەیوەندییە، لە بێدەنگکردنی مێشک (بەوەی ڕێگە نەدەی خەریکی بەسەرهاتەکانی ڕابردوو و ڕێکخستنی کاروبارەکانی داهاتوو بێت) و بەڕێوەبردنی هەستەکاندایە.

بەرهەمەکەشی بریتییە لە، یەکانگیربوونی ڕۆحی لەگەڵ منداڵەکەی بەرامبەرتدا.

پەیوەندیی جۆری کە بە واتای بەسەربردنی کاتی بەرهەمدار دێت، کاتێک دروست دەبێت کە تۆ بتوانیت بەبێ هیچ هۆکار و ئامرازێک (بۆ نموونە؛ یاری) ئەو بدوێنیت.

پەیوەندیی جۆری، واتە جێهێشتنی دنیای جەنجاڵی گەورەکان و پێنانە ناو دنیا بێگەردەکەی ئەوانەوە.

# 76

خوانی ئێواران بۆیە
گرنگە، چونکە هەموو
ئەندامانی خێزان پێکەوە
کۆ دەکاتەوە

یەکێک لە گەورەترین پێداویستییەکانی منداڵی قوتابخانە، دیتنی پێکەوەیی ئەندامانی خێزانەکەیەتی.

دیتنی ئەو دیمەنە، لە ڕووی سۆزدارییەوە گڕوتین دەبەخشێت بە ناخی.

دایک و باوکی بەئاگا، سوود لە هەموو هەلێک وەردەگرن بۆ کۆکردنەوەی ئەندامانی خێزانەکەیان.

وەک دەزانن، باشترین هەلیش خوانی ئێوارانە.

ئەگەر تاکو ئێستا وامان زانیوە مەبەست لە کۆبوونەوەی سەر خوانی ئێواران، پڕبوونی گەدەیە و هیچی تر، ئەوا بزانن دنیایەک جوانیمان لەکیس خۆمان داوە.

چونکە خوانی ئێواران:

وادەی گفتوگۆی خێزانییە.

وادەی خاڵیبونەوەیە لە گوشار و نارەحەتییەکانی ڕۆژ.

وادەی بەشکردنی خۆشی و بەسەرهاتەکانە.

جگە لەوەی کە باشترین کاتە بۆ منداڵ، تاوەکو بەئاسانی گوزارشت بکات لە خۆی.

## 77

# کارامەیی ئاخاوتن و دروستکردنی پەیوەندی، گرنگترین شتە دایک و باوکی منداڵانی قوتابخانە فێری ببن

بەداخەوە، دڵەڕاوکەی هەرە گەورەی زۆربەی زۆری ئەو دایک و باوکانەی منداڵەکانیان لە قوتابخانەن، ئەوەیە منداڵەکەیان لە قوتابخانەدا سەرکەوتوو نەبێت.

پەرۆشیی ئەوەن منداڵەکەیان لە هاوپۆلەکانی دوا نەکەوێت، نمرەی بەرز بەدەست بێنێت، لە قسەی مامۆستاکانی دەرنەچێت، هەموو ئەرکەکانی ماڵەوەی جێبەجێ بکات و بەجوانی وانەکانی بخوێنێت.

کەچی کاتێك ورد دەبینەوە، دەبینین هیچ کام لەوانە ناچنە خانەی ئەو پێداویستییانەوە، کە پێویستە دایک و باوک بۆ منداڵەکانی دابینیان بکات.

منداڵ ئەم داواکارییانەی هەیە لە باوانی:

کاتێك لەگەڵی دەدوێن، بە دڵ و بە گیان بیدوێنن.

کاتێك شتێکیان بۆ دەگێڕێتەوە، گوێی بۆ بگرن و ڕێی بدەن گوزارشت لە خۆی بکات.

هەستەکانی پشتڕاست بکەنەوە و ئەو باوەڕەی لەلا دروست بکەن کە: "بەڵێ، ئەوان بەباشی لە من تێدەگەن."

ئەو دایک و باوکانەی هەموو سەرنجی خۆیان لەسەر مەسەلەی خوێندن چڕ کردووەتەوە، لە زۆر حاڵەتدا منداڵەکانیان لە ڕووی خوێندنەوە سەرکەوتوون، بەڵام ئایا دەتوانین هەمان شت بۆ پەیوەندیی نێوانیشیان بڵێین؟ ئەمەیان دڵنیا نیم!

# 78

# لێپرسینەوە و تەنگ پێهەڵچنین، پێچەوانەی بنەماکانی ئاخاوتن و پەیوەندیی دروستکردنی سەرکەوتووە

هەموو دایک و باوکێک مافی خۆیەتی، بزانێت منداڵەکەی چۆن و لەگەڵ کێ ڕۆژەکەی بەسەر بردووە..

بەڵام لێپرسینەوەی بەردەوام و تەنگ پێهەڵچنینی هاوشێوەی: "ئەمڕۆ چیت کرد؟ چووی بۆ کوێ؟ لەگەڵ کێ چووی؟" پێچەوانەی بنەماکانی ئاخاوتنی بەرهەمدارە.

ئەگەر ئەوان دەست بکەن بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ئەو ڕۆژەیان؛ چییان کردووە و لە فلانە هەڵوێستدا هەستیان بە چی کردووە... و هتد، ئیتر ئەویش فێر دەبێت بێ دوودڵی شتەکانی خۆی بەش بکات.

لە سایەی ئەم جۆرە پەیوەندییەدا، منداڵ هەست بە ئاسایش و دڵنیایی دەکات.

# 79

لەبری ئەوەی باسی
چۆنێتیی ئەنجامدانی
کارەکەی بۆ بکەین،
باشتر وایە چییەتی
کارەکەی بۆ ڕوون
بکەینەوە

سیستمی هاوچەرخی پەروەردە و فێرکاری، زیاد لە ئەنجام، زیاتر گرنگی بەو ئەزموونانە دەدات کە قوتابی (بە درێژایی پرۆسەی فێربوون بەدەستیان دەهێنێت.

لەبەرامبەردا، سیستمی کلاسیکی هەموو سەرنجێکی لەسەر ئەنجامە.

فێربوونی ڕاستەقینە لەوەدا نییە قوتابی فێر بکەیت (چۆن) شتەکان ئەنجام بدات، بەڵکو لەوەدایە (چیەتی)ی شتەکانی بۆ ڕوون بکەیتەوە؛ شتەکە خۆی چییە و بۆچی وایە.

لە یەکەمیاندا سەرکەوتنەکە هی فێرکارەکەیە، لە دووەمیاندا هی فێرخوازەکەیە.

بەڵێ، سەرکەوتنی ڕاستەقینە لەوەدایە شتەکەی بۆ ڕوون بکەیتەوە، پاشان بواری بدەیت لە ڕێی بەگەڕخستنی تواناکانی خۆیەوە و لە ئەنجامی تاقیکردنەوەی ڕێگە جیاوازەکانەوە، خۆی بە ئەنجامەکە بگات.

ڕەنگە ئەم شێوازە فێرکارییە ماوەیەکی زیاتری پێ بچێت، ئەوەندە هەیە هەر هەنگاوێک، هەر تاقیکردنەوەیەک کە منداڵەکە بە درێژایی ئەو ماوەیە ئەنجامی دەدات، بە بەشێکی ڕاستەقینەی پرۆسەی فێربوونەکە دادەنرێت.

# 80

**منداڵانی قۆناغی سەرەتایی، باشتر وایە ڕۆژانە خەرجییان بدرێتێ، نەوەک هەفتانە**

ئەو منداڵەی خەرجیی هەفتانەی دەدرێتێ، پارەکەی بەشی چی بکات، ئەو حەز دەکات بیکڕێت. واتە؛ بە ڕۆژێک هەمووی تەواو دەکات، ئەمە حاڵەتێکی ئاساییە.

چونکە منداڵان لەدوای تەمەنی (١٢) ساڵییەوە، ئینجا دەبنە خاوەنی ئەو ئیرادەیەی کە وردە وردە بتوانن کۆنترۆڵی هەست و حەز و ڕەفتارەکانیان بکەن.

لەدوای ئەم تەمەنەوە، ڕەنگە ئیتر بتوانێت خەرجیی هەفتانە و کاروباری گیرفانی خۆی ڕێک بخات.

لەبەر ئەم هۆیە، باشتر وایە ڕۆژانە خەرجی بدرێت بە منداڵی سەرەتایی، هاوکات پێشوەختە بۆی ڕوون بکرێتەوە کە بۆی هەیە چی بکڕێت.

ئەوەش گرنگە خەرجییەکە بەشی ئەو پێویستییە بکات کە دەیەوێت بیکڕێت؛ نە کەمتر و نە زیاتر. بۆ نموونە؛ دەکرێت پێی بوترێت: "دەتوانیت لەفەیەک و شەربەتێک بکڕیت" پاشان بەگوێرەی ئەوە خەرجییەکەی دەدرێتێ.

# 81

شەڕی نێوان
خوشک و برا مایەی
بەهێزبوونیانە، بە
مەرجێک ڕقوکینەی
ئاوێتە نەبێت

شەڕی نێوان خوشک و برا، یەکێکە لەو بابەتانەی کە زۆر جار باوان گیر دەخۆن بەدەستیەوە.

بەڵام ئەگەر لە گۆشەیەکی جیاوازەوە سەیری بابەتەکە بکەین، ئەوکات دەبینین کە شەڕ و هەرای نێوان خوشک و برا زۆربەی جار لێهاتوویی و شارەزاییان پێ دەبەخشێت، نەوەک زیان و مەترسی.

بۆ نموونە؛ ئەو کاتەی یەکێکیان دەست دەبات بۆ قژی ئەوی تریان و ڕایدەکێشێت، ئەویش دەستەپاچە ناوەستێت و پاڵی پێوە دەنێت. یان دەبینی یەکێکیان ورکی گرتووە و پێداگری دەکات تەنیا خۆی یاری بکات، کەچی ئەوەندە نابات لەناو خۆیاندا ڕێک دەکەون و گرفتەکە چارەسەر دەکەن.

ئەمانە نموونەی ئەو توانا کۆمەڵایەتییانەن، کە منداڵان لە ئەنجامی شەڕ و پێکدادانی نێوانیانەوە فێری دەبن.

بێگومان ئەمە ئەو ناکۆکی و گرژییانە ناگرێتەوە کە ڕقوکینەی تێکەڵ بووە، چونکە ئەوەیان دۆخێکی گرفتاوییە.

شەڕ و گرژییەک ڕقوکینەی تێدا بێت، نیشانەیە بۆ بوونی گرفتی سۆزداری، چونکە ئێمە دەزانین ئەگەر منداڵ لە شوێنێکدا زیانی پێ بگات، هەوڵ دەدات بە شێوەیەک لە شێوەکان قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە و داخی دڵی خۆی بەرەو شوێنێکی دیکە ئاڕاستە بکات.

با وا دابنێین، منداڵێک لەلایەن باوکیەوە ڕووبەڕووی توندوتیژی دەبێتەوە. لەم بارەدا قوربانییەکە بە ئەندازەی ئەو توورەییەی بەرامبەر باوکی هەڵیگرتووە، یان بە ڕێژەی ئەو ئازار و زیانەی بەری کەوتووە، بە نەفرەت و قینەوە هێرش دەکاتە سەر خوشک و براکانی.

کەواتە لەم بارەدا باشترین شت ئەوەیە، باوان هەوڵ بدەن ئەو هۆکارە بدۆزنەوە کە ڕقەکەی بەرهەم هێناوە، کە ئەویش لە زۆرینەی حاڵەتەکاندا پێداویستییەکی سۆزداریی فەرامۆشکراوە.

لەوانەیە ئەمە شێوازە ئاسانەکە نەبێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە شێوازە دروستەکەیە.

# 82

کەسێتیی مرۆڤ کاتێک
سروشتی دەبێت، کە
خۆی چۆنە لە ڕاستیدا،
بتوانێت هەر بەو
شێوەیەش دەربکەوێت

ئەگەر بێتو گەشە لەسەر ڕەوتە ئاسایەکەی بەردەوام بێت، کەسێتیی منداڵ دۆخە سروشتییەکەی خۆی دەپارێزێت و ناوەوە و دەرەوەی وەک یەک دەبێت.

خۆی چۆنە لە ڕاستیدا، هەر بەو جۆرە دەبێت، پێویستی بەوە نابێت نمایش بکات و دەمامک بپۆشێت.

سروشتییە و زۆرلەخۆکردنی پێوە دیار نییە.

توندوتیژی و گوشاری سەر منداڵی قوتابخانە، دەبێتە هۆی ئەوەی دەستبەرداری ناخی خۆی ببێت و دەوروبەر چۆنیان پێ خۆشە، ئەو بەو جۆرە خۆی نیشان بدات. هەر هەنگاوێکیش بەرەو ئەو ئاڕاستەیە، دوورکەوتنەوەیە لە سروشتیبوون و خۆڕسکبوون.

ئەم حاڵەتە، بە یەکێک لە بەربەستە گەورەکانی بەردەم دروستبوونی کەسێتی دادەنرێت.

منداڵ کاتێک دەبێتە خاوەنی کەسێتی، کە ڕەفتار و بڕیارەکانی هەڵقوڵاوی ناخی خۆی بن.

لەبەر ئەوە نە سزا نە پاداشت، نە زۆرلێکردن نە ڕەخنەلێگرتن، هیچیان ڕۆڵی بنیادنەر ناگێڕن لە دروستکردنی کەسێتیی منداڵدا.

ناسینەوەی پێداویستییەکانی گەشە و کارامەیی دروستکردنی پەیوەندی، لەو کەرەستە پەروەردەییە گرنگانەن کە پێویستە باوان ئاشنای بن، تاوەکو بتوانن یارمەتیی منداڵەکانیان بدەن لە نەخشاندنی کەسێتییاندا.

# 83

## سەرپشککردنی منداڵ لە بڕیارەکانیدا، کەسێتییەکەی بەهێز دەکات

دیارترین خاڵی جیاکەرەوەی کەسێتی ئەوەیە، کە دۆخێکی تایبەتمەندە.

مرۆڤێک خاوەنی کەسێتییە کە لە خۆی بچێت، نەوەک ئەوەی هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوەیە لێکچووی کەسانی تر بێت.

هەر لە تەرزی پۆشینەوە بیگرە، تا دەگاتە شێوازی ئاخاوتن و پێکەنین.

ئەم تایبەتمەندێتییە، لەدوای تەمەنی (٧) ساڵییەوە زیاتر بەدیار دەکەوێت.

ئارەزووی کچان بۆ تاقیکردنەوەی جلی جیاواز و پۆشینی مۆدێلی جۆراوجۆر، هەوڵێکە بۆ دۆزینەوەی تەرزی تایبەت بە خۆیان.

کوڕانیش کە هەندێك جۆری خواردنیان بەدڵ نییە، هی ئەوەیە دەیانەوێت زەوق و سەلیقەی خواردنی تایبەت بە خۆیان هەڵبژێرن.

چەند خۆشە دایک و باوک پەسنی (کەللەڕەقی) و (نازونووز) نەدەنە پاڵ ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە، هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو بە تێگەیشتنێکی وردتر مامەڵەی لەگەڵدا بکەن و پێیان وا بێت کە ئەوە هەوڵی کچەکەیان/کوڕەکەیانە بۆ (بەرەوپێشبردنی کەسێتیی تایبەت بە خۆی).

# 84

## کەسێتیی مامۆستا، زەمینەی دروستبوونی کەسێتیی قوتابییەکانیەتی

کاتێک دەتوانین قسە لەسەر کاریگەریی کەسێتیی مامۆستا لەسەر قوتابییەکانی بکەین، کە ئەو مامۆستایە خاوەن تەرزێکی تایبەتمەندی خۆی بێت.

مامۆستایەکی لەو شێوەیە، بە هەموو پێوەرێک سەرمەشقە و هەڵسوکەوتەکانی بووەتە نموونەی باڵا بۆ قوتابییەکانی.

لەم ڕووەوە، دوای دایک و باوک، بەهێزترین کەس کە کاریگەریی هەیە لەسەر گەشەی کەسێتیی منداڵ، مامۆستایە.

# 85

# گۆڕینی کەسێتی، لە بنیادنانی قورسترە

لەناوبردنی کەسێتییەکی ڕەگداکوتاو و بنیادنانەوەی دانەیەکی نوێ لە جێگەیدا، زۆر لەوە قورسترە لە بناغەوە کەسێتییەک بنیاد بنێیت.

لەبەر ئەوەی بەردی بناغەی کەسێتی، بریتییە لە هەستەکان.

دەستبەرداریی هەستەکانیش، بە ئەندازەی سەرلەنوێ بنیادنانەوەی کەسێتی، سەخت و گرانە.

بۆ نموونە؛ یارمەتیدانی ساوایەک بۆ ئەوەی هەستی متمانە و دڵنیاییەکەی ناخی پارێزراو بێت و زیانی پێ نەگات، ئاسانترە لەوەی گەورەساڵێک هەوڵ بدات تازەبەتازە هەستی متمانە و دڵنیایی لە ناخیدا بچێنێت.

یان، هەستکردن بە نرخ و گرنگیی خود بۆ منداڵێک کە قۆناغەکانی گەشەی بە شێوەیەکی سروشتی بەڕێ کردووە، زۆر ئاسانترە بەراورد بە کەسێکی پێگەیشتوو کە تا ئەو کاتە خۆی بێنرخ بینیوە و دەیەوێت لە ئێستاوە هەست بە نرخ و گرنگیی خۆی بکات.

مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵ لەسەر بنەمای ڕێز، لە گرنگترین ئەرکەکانی سەرشانی ئێمەی پەروەرشیارانە، چونکە لەو ڕێیەوە دەتوانین پارێزگاری لە شکۆ و پاکیی دنیای هەست و سۆزیان بکەین.

# 86

**کاتێک پەروەردەی سێکسی دەدرێت بە منداڵانی قوتابخانە، پێویستە وریا بین (هەستی تایبەتمەندێتی)یان نەڕوشێنین**

یەکێک لە تایبەتترین قۆناغەکانی گەشە، قۆناغی گەشەی سێکسییە.

جێی تێڕامانە، چ کچان چ کوڕان، حەز ناکەن گۆڕانکارییەکانی ئەم قۆناغە لای هیچ کەسێک باس بکەن.

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، هەستە سێکسییەکان هەستگەلێکی کەسی و تایبەتمەندن، ڕێگری ناوەکی هەیە لەبەردەم ئاشکراکردنیاندا.

فەرامۆشنەکردنی ئەم لایەنە لە کاتی وتنەوەی پەروەردەی سێکسیدا، لەوپەڕی گرنگیدایە. گەر نا، گەیاندنی چەند زانیارییەک، ئەوە ناهێنێت هەستی تایبەتمەندێتیی منداڵەکانمانی بۆ بەخت بکەین.

باسکردنی ئەم هەستە تایبەت و کەسییانە لەناو کۆمەڵدا، با بە نیازی زانیاری پێدانیش بێت، کاریگەریی نەرێنی لەسەر گوێگرەکان جێ دەهێڵێت، چونکە دەبێتە مایەی شەرم و هەستکردن بە شەرمەندەیی.

نەنگهەڵچنین بە سنوورەکانی ئەم دوو هەستەش -شەرم و شەرمەندەیی- دوا جار دەبێتە هۆکاری لەدەستدانیان.

هەستیاریی بابەتەکە، داخوازی ئەوەیە بەم ئاگاییەوە پەروەردەی سێکسی بڵێینەوە. پاراستنی سەلامەتی و بێخەوشیی هەستەکان، پێش هەموو شتێکە.

# 87

## ئەو منداڵانەی کەسێتییان بەهێزە، چۆن دەزانن وەربگرن، ئاوەهاش دەزانن ببەخشن

پەروەرشیاران گرنگە ئاگاداری ئەم خاڵە بن: چەندە منداڵەکانمان فێری وەرگرتن دەکەین، دەبێت هێندەی ئەوەندەش فێری بەخشینیان بکەین.

پێویستە ئاگامان لە خۆمان بێت، نەکەوینە داوی ئەوەی هەموو سەرنج و خەیاڵمان لای ئەوە بێت کە:

چەندی هێناوە؟

چەندی خواردووە؟

چەندی هەیە؟

ئینجا پێشمان وا بێت، بەباشی پەروەردەمان کردووە.

ئەرکی ئێمەیە فێریان بکەین کە ژیان تەنها سەرکەوتن نییە، شکستیش بەشێکی سروشتیی ژیانە، لەدەستدانیش هەر وەکو بەدەستهێنان ئاساییە.

کەسێتییەک هەر لەسەر بردنەوە و سەرکەوتن ڕاهاتبێت و گومانی وا بێت ژیان تەنیا بریتییە لەوانە، کەسێتییەکی ناکامڵ و پێنەگەیشتووە.

# 88

ئالوودەبوون بە
تەکنەلۆژیاوە، لێرەوە
دەست پێ دەکات:
**”وازی لێ بێنە، با کەمێک
پێوەی سەرقاڵ ببێت!“**

هەموو ئامێرێکی تەکنەلۆژی، سوود و قازانجی خۆی هەیە:
کۆمپیوتەر، تۆماری زانیارییەکانمانە.
ئینتەرنێت، جیهانمان بۆ بچووک دەکاتەوە.
مۆبایل دەمانبەستێتەوە پێکەوە.

ئالوودەبوون لەوێوە دەست پێ دەکات کە منداڵەکانمان لەدەرەوەی ئەو ئامانجانە، دەسپێرین بە ئامێرە تەکنەلۆژییەکان، یان خۆمان کارێکمان هەیە و دەمانەوێت دەستمان نەگرن: "بەڵکو بە مۆبایلەکەوە سەرقاڵ بێت و منی بیر بچێتەوە!"

بۆ ئەوەی باوان بتوانن باشتر هاوکاریی منداڵەکانیان بکەن، گرنگە هاوسەنگی بپارێزن. واتە؛ نە ئەوەی لە تەکنەلۆژیا بسڵەمنەوە، نە ئەوەش بەبێ هیچ ڕێسا و سنووربەندییەک بیخەنە بەر دەستیان.

هەڵبەتە ئینتەرنێتی بێسنوور، ئایپاد و مۆبایلی هەمیشە بەردەست، لە هەموو حاڵەتەکاندا پەسەندکراو نییە.

ئەوە دەکەوێتە ئەستۆی ئێمە، کە وەک دایک و باوک دابنیشین لەگەڵیان و ئامانجی سەرەکی لە بەکارهێنانی ئامێرە تەکنەلۆژییەکانیان بۆ ڕوون بکەینەوە.

گرنگە هەم خۆمان و هەم ئەوانیش ڕەچاوی ئەم بنەمایە بکەین، لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت و تەکنەلۆژیا بە شێوەیەکی گشتی: "هەر کات کارەکەت تەواو بوو، هەڵیگرە/دایخە/ بیکوژێنەرەوە."

89

مناڵ هەتا ناچار

نەکرێت پارێزگاری لە

خۆی بکات، پەنا ناباتە

بەر درۆکردن

”

درۆ شتێکی نامۆیە بە سروشتی منداڵ.

منداڵ ئەگەر هەست بە ترس و دڵەڕاوکە بکات، دەست دەکات بە شێواندنی ڕاستییەکان. لەپێناو پاراستنی خۆیدا، شتانێک دەڵێت کە لە ڕاستیدا بەو جۆرە نییە.

کاتێك دایکان و باوکان خۆیان لەبەردەم درۆی منداڵەکەیاندا دەبیننەوە، گرنگە گوشاری زیاتری نەخەنە سەر و پەنا نەبەنە بەر هەڕەشە و گوڕەشە. لەبری ئەوە، هەوڵ بدەن بەدوای هۆکاری ئەو ترسەدا بگەڕێن، کە پاڵی بە منداڵەکەیانەوە ناوە درۆ بکات.

تۆ بڵێی لە ئێمە ترسابێت، یان لە مامۆستاکەی؟

تۆ بڵێی نیگەرانی ئەوە بێت لەناو هاوڕێکانیدا جێی نەبێتەوە و کەس یاری لەگەڵ نەکات؟

لە وەها بارێکدا، مامەڵەی دروست ئەوەیە ترس و دڵەڕاوکەی زیاتری بۆ دروست نەکەیت، چونکە ئەو خۆی لە بنەڕەتدا لەتاو ترس و دڵەڕاوکە ڕاستییەکانی شێواندووە.

دایک و باوکی لێزان، چاو لە منداڵەکەی سوور ناکاتەوە و بە پرسیارگەلێکی هاوشێوەی: "ئادەی بزانم بۆچی درۆ دەکەی؟" شەرمەزاری ناکات، لەجیاتی ئەوە، کەشێکی ئارام و دڵنیاییبەخشی بۆ ئامادە دەکات و بەنەرمونیانی لێی نزیک دەبێتەوە.

چونکە دەزانێت ئەگەر شتێک هەبێت لەم دنیایەدا درۆ قەڵاچۆ بکات، ئەوا ئەو شتە جگە لە هەستکردن بە ئاسایش و دڵنیایی، هیچی تر نییە.

“

# 90

## جوانترین دیاری بۆ منداڵی تەمەن (7) ساڵ، کاتژمێری دەستییە

لەدوای (٧)ساڵییەوە، منداڵ پێویستی بەوەیە فێری ڕێکخستنی کاتەکانی ببێت.

لەو ڕێیەوە، وردە وردە ئیرادەشی بەهێز دەبێت.

گرنگە ئیتر لەم تەمەنەوە ئاگایی ئەوە بەدەست بێنێت، کە چ شتێک لەکوێدا و بە چەندێک ئەنجام دەدرێت. ئەم ئاگاییە یارمەتی دەدات، درک بە کاریگەریی کات و چۆنێتیی تێپەڕبوونی بکات.

لەدەستکردنی کاتژمێرێك، بەزیادەوە ئەم ئەرکە ڕادەپەڕێنێت. منداڵێک لەوە تێگەیشتبێت کە کات چۆن دەڕوات، بەدڵنیاییەوە لە گرنگی و پێویستیی پلاندانان و کات ڕێکخستنیش تێدەگات.

کاتژمێرەکەی دەستی پێی دەڵێت کە ئەگەر سبەینێ لە کاتی خۆیدا هەڵنەستێت، ئەوا ناتوانێت ئەو کارانە ئەنجام بدات کە بەنیاز بووە نیوەڕۆ ئەنجامیان بدات. کە نیوەڕۆش نەیتوانی، ئیتر مانایەک نامێنێتەوە بۆ ئەنجامدانی، چونکە کاتەکەی بەسەر دەچێت.

# 91

## ئەو دایک و باوکانەی ئیرادەیان لاوازە، منداڵەکانیشیان وەکو خۆیان دەردەچن

ئیرادە بریتییە لە توانای بەردەوامبوون لەسەر کارێک، یان ڕەفتارێکی دیاریکراو.

لە هەمان کاتدا، توانای دەستهەڵگرتن و وازهێنانیش دەگرێتەوە.

ئیرادە خەسڵەتێکی زگماك نییە، تایبەتمەندییەکە دواتر بەدەست دێت.

دەوروبەری منداڵ چەندە بە کەسانی خاوەن بڕیار و مکوڕ تەنرابێت، ئەوەندە چانسی بەدەستهێنانی ئیرادەی زیاتر دەبێت.

منداڵ هێزی پێداگری و توانای مکوڕبوونی لەکوێ بوو، ئەگەر لە باوانیەوە نەیبینیبێت!

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بابەتە دیوێکی تریشی هەیە کە پێویستە ئاگاداری بین؛ ئەو دایک و باوکانەی ئیرادەیان بەهێزە، نابێت چاوەڕێی هەمان ئاست و هەمان ئیرادە لە منداڵەکەیان بکەن، چونکە ئەم تایبەتمەندییە لە منداڵدا کاتێك بەهێز دەبێت، کە بە ویست و ئیرادەی خۆی ئەو شتانە ئەنجام بدات کە لە توانایدایە.

92

لەوانەیە
هەڵسوکەوتەکەی
نەگونجاو بێت،
بەڵام بزانە کە خۆی
نەگونجاو نییە

ڕەفتاری هەڵە بۆیە بە هەڵە دادەنرێت، چونکە خودی ڕەفتارەکە/کردەکە هەڵەیە.

منداڵ کە ڕەفتارێکی هەڵە دەنوێنێت، مانای ئەوە نییە منداڵێکی خراپە، مانای ئەوەیە (ئەو ڕەفتارە) هەڵەیە.

لەبەر ئەوە کاردانەوەی توند و دڵ ڕەنجێنەر بەرامبەر هەڵەی منداڵەکانمان، نەوەک ئەوەی پاشگەزیان ناکاتەوە لە ڕەفتارە هەڵەکە، بەڵکو کەسێتیشیان بریندار دەکات.

# 93

ئاكار و ڕەوشتە جوانەکان
کاتێك دەبن بە بەشێک لە
کەسێتی، کە خاوەنەکەی
لە دڵەوە باوەڕی پێیان
بێت

بەشێک لە گەورەساڵان بە مەبەستی چەسپاندنی ئاکار و ڕەوشتی پەسەند لە منداڵەکانیاندا، دەچن زۆریان لێ دەکەن بۆ ئەوەی کۆمەڵە هەڵسوکەوت و ڕەفتارێک بنوێنن.

کاتێکیش منداڵ بەناچاری ئەو هەڵسوکەوتانە دەکات، ئەوان پێی دڵخۆش دەبن.

بە ڕەفتارێک دەوترێت ڕەفتاری ڕەوشتی، کە ڕەنگدانەوەی باوەڕی ناوەکیی خاوەنەکەی بێت، جووڵەیەکی بێ ناوەرۆک نەبێت لەژێر سایەی ئاڕاستەکاریی کەسانی تردا ئەنجامی دابێت.

ئەو منداڵەی لەلایەن باوانیەوە زۆری لێ دەکرێت بۆ ئەوەی داوای لێبوردن لە هاوڕێکانی بکات، فێری ئاکاری پۆزشهێنانەوە نابێت بەرامبەر هەڵەکانی، چونکە هێشتا نازانێت بۆچی دەبێت داوای لێبوردن بکات.

بە هەمان شێوە؛ درۆنەکردنی منداڵێک کە لە سزا و توورەیی باوکی دەترسێت، ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو منداڵە خاوەن ڕەوشتی ڕاستگۆییە.

# 94

یەکێک لەو کارامەییە
گرنگانەی پێویستە
هەموو دایک و باوکێک
فێری منداڵەکەی بکات،
کارامەیی ڕێکخستنی
هەڵسوکەوتە

توانای خۆڕێکخستن، بە یەکێک لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ دادەنرێت.

کەسێک دەتوانێت خۆی بسەلمێنێت، کە توانای ڕێکخستنی بیرکردنەوە و هەست و هەڵسوکەوتەکانی هەبێت.

چاوساغی و ڕێنیشاندانی باوان لە تەمەنی منداڵییەوە، ڕێخۆشکەرە بۆ بەدەستهێنانی ئەم تایبەتمەندییە.

بەشی هەرە زۆری دایکان و باوکان، لەبری ئەوەی منداڵەکانیان لەسەر ڕێکخستن و ئاڕاستەکردنی سیانەی (بیرکردنەوە، هەست، هەڵسوکەوت)ەکانی خۆیان ڕابهێنن، دەچن دەیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و ئەمان بۆیان ئاڕاستە دەکەن، پێشیان وایە کارێکی زۆر باش دەکەن.

کەی منداڵ جڵەوی ژیانی خۆی گرتە دەست و توانیی خۆی کۆنترۆڵ بکات، ئەو کاتە دەتوانێت بەرەو سەرکەوتن هەنگاو بنێت.

## 95

پەروەدەی تایبەتمەندێتی، بریتییە لە فێرکردن و ڕاهێنانی منداڵ لەسەر چۆنێتیی بەڕێوەبردنی هەستەکانی

پەروەردەی تایبەتمەندێتی، بەزۆر جیاکردنەوەی کوڕان و کچان نییە لە یەکتری، بەڵکو ڕاهێنانی هەنگاوبەهەنگاوی منداڵە لەسەر چۆنێتیی ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی هەست و سۆزەکانی.

دەشێت ئەو هەستانە لە هەندێک حاڵەتدا هەستی تووڕەیی، ئێرەیی، خۆشەویستی، یان لە هەندێک حاڵەتی تردا، هەستی ڕەگەزی بن.

کاتێک جگەرگۆشەکەمان دەبینن لە شتێک تووڕە بووە، لێرەدا ڕەفتارە دروستەکە ئەوەیە فێری بکەین چۆن کۆنترۆڵی تورەییەکەی بکات، نەوەک ئەوەی هەڕەشەی لێ بکەین: "هەستم لێت بدەم!"

یان کە کچەکەمان/کوڕەکەمان هەستێکی خۆیمان بەرامبەر بە کەسێک لە ڕەگەزی بەرامبەر لەلا باس دەکات، لەجیاتی ئەوەی شەرمەزاری بکەین بە کاردانەوەکانمان: "بەدڕەوشتی تا ئەو ڕادەیە!"، دروست وایە فێری بکەین چۆن لەگەڵ ئەم جۆرە هەستانەدا هەڵبکات و جڵەویان بگرێتە دەست.

دیارترین سیمای کەسە بەهێزەکان، توانای خۆبەڕێوەبردنیانە.

## 96

ئەو کەسەی بەمنداڵی
سووکایەتیی پێ کراوە، کە
دەبێت بە دایک یان باوک،
ئەگەری زۆرە بەو شێوە
ڕەفتار بکاتەوە

گەورەکان کە سەریان لێ دێتەوە یەک و خۆیان لەبەردەم کێشەیەکدا دەبیننەوە، یەکەم ڕێگە کە دەیگرنە بەر بۆ چارەسەری کێشەکە، ئەو ڕێگەیەیە کە بەمنداڵی لەسەر خۆیان تاقی کراوەتەوە.

ئەو دایک و باوکانەی کێشەکانیان بە هاتوهاوار و شەڕ و سووکایەتی چارەسەر دەکەن، ئەمە بەبۆماوەیی بۆ منداڵەکانیان جێ دەهێڵن. لە گەورەییدا، ئەوانیش لەسەر هەمان ڕێچکە و بە هەمان شێواز کێشەکانیان چارەسەر دەکەن.

97

# ڕەگوڕیشەی مەیلی باوان بۆ توندوتیژی، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی

توندوتیژی خاسیەتێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە دەگوازرێتەوە.

ئەو کەسانەی لە منداڵیدا توندوتیژییان بەرامبەر کراوە، لە گەورەییدا مەیلیان بەلای دووبارەکردنەوەیدا دەچێت.

کاتێک بە ڕەگوڕیشەی ئەو توندوتیژییەدا دەچینە خوارەوە، کە بەشێك لە دایک و باوکان بەرامبەر ڕۆڵەکانیان دەیکەن، شتێکی سەیر دەبینین؛ ئەو توندوتیژییە دەبینین کە لە منداڵیی خۆیاندا، بەرامبەریان کراوە.

جا یان ئەو شەق و زللەیەیە کە دایکی یان باوکی لێی داوە، یان ئەو سووکایەتییەیە کە فڵانە مامۆستا لەبەر چاوی هاوپۆلەکانی بەرامبەری نواندوویەتی، یان ئەو پەلاماردانەیە کە لەلایەن دراوسێکەیانەوە کراوەتە سەری.

لە منداڵیدا هەر جۆرە توندوتیژییەک بەرامبەر منداڵ ئەنجام درابێت، لە قووڵایی دەروونیدا شوێنەوارەکەی هەر دەمێنێتەوە و بە چەشنی بۆمبێکی کاتڕێژکراو هەمیشە ئامادە دەبێت بۆ تەقینەوە.

جاری وایە بە هاوسەرەکەیدا دەتەقێتەوە، جاری وەهایشە بە منداڵەکانیدا.

# 98

# نواندنی ڕەفتاری منداڵانە، بەشێکە لە سروشتی منداڵ

هەڵبەزودابەز، ڕاکەڕاک، تریقە لێدان، ئاو بە خۆدا ڕشتن، زویربوون و ئاشتبوونەوە و... هتد، لە نموونەی ڕەفتارە سروشتییەکانی منداڵن.

کەسی دەروون تەندروست دنیای لێ نایەتەوە یەک، بەوەی منداڵێک لەبەر چاویدا هەڵسوکەوتی منداڵانە بنوێنێت.

کەم ئارامگریی بەرامبەر هەڵسوکەوتی منداڵ، بە یەکێک لە نیشانەکانی کەسێتیی نائارام دادەنرێت.

ئەو کەسەی بە ڕەفتاری منداڵانەی منداڵ بزە دەکەوێتە سەر لێوی، کەسێکە منداڵ لەلایدا هەست بە دڵنیایی و ئاسایش دەکات.

# 99

## بەختەوەرە ئەو کەسەی لە منداڵیدا وەکو منداڵ ژیاوە

یەکێک لە لایەنە دیارەکانی کەسانی بەهێز و بەختەوەر، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە بەکامی دڵ لە منداڵییەکەیاندا ژیاون.

گەورەساڵ، لە کرۆکی منداڵییەکەیەوە هێز و تین وەردەگرێت.

ئەم کرۆکە چەندە پووچەڵ بێت، خاوەنەکەشی ئەوەندە لاواز دەبێت، چەندێکیش پڕ بێت، خاوەنەکەشی ئەوەندە پڕ جۆش و وزەی ژیان دەبێت.

زۆرێک لە گەورەکان کە ئاوڕ لە ڕابردوویان دەدەنەوە، منداڵیی خۆیانیان بیر نایەتەوە.

لەبیرنەمانی منداڵی، ئاماژەیەکە بۆ ئەزموونی تاڵی خاوەنەکەی لەو تەمەنەدا..

لەناو زیندەوەراندا، مرۆڤ تاکە زیندەوەرە کە خراپ مامەڵە لەگەڵ ڕۆڵەی خۆیدا دەکات.

## 100

سەربەخۆیی

کەسی، نیشانەی

گەشەیەکی

تەندروستە

منداڵ چەندە بتوانێت وەک تاکێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی سنوورەکاندا پەیڕەوی لە ئازادییەکانی بکات و لە پەیوەندییە مرۆییەکانیشدا کارامەیی خۆگونجاندنی هەبێت، کەسێتییەکەی ئەوەندە دامەزراو و بەهێزە.

خاوەن کەسێتیی هاوسەنگ ئەو کەسەیە، کە لە پەیوەندییە مرۆییەکاندا ناڵێت: "پێتان خۆش بێت یان نا، من هەر ئەمەم، ئێوە ناچارن بەم جۆرە من قبوڵ بکەن!" واتە؛ ناچێت بەگژ ژینگە کۆمەڵایەتییەکەیدا.

هاوکات کەسێکیشە سازش لەسەر تایبەتمەندییەکانی کەسێتییەکەی ناکات و لەوانی تردا ناتوێتەوە، ناڵێت: "ئێوە چۆنتان بوێت، من بەو جۆرە دەبم!"

سەربەستە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا پەیوەستە. لەناو پانتایی چاوەڕوانییەکانی دەوروبەردا خۆی ناتوێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەندامێکی هاوکار و خۆگونجێنی ناو کۆمەڵگەشە.

# پێڕست

# 100 ڕێسای بنەڕەتی لە پەروەردەکردنی منداڵدا

گرنگترین وێستگە پەروەردەییەکانی ئەم تەمەنە، لە ١٠٠ ڕێسای پوختدا.

ئەم پەرتووکە، دایکان و باوکان لە هەستیاریی ئەم قۆناغە ئاگادار دەکاتەوە، کە نازداریی تەمەنی منداڵی کۆتایی پێدێت و فشاری گەورەکان جێگەی دەگرێتەوە. هاوکات ڕێنماییان دەکات بۆ باشترین شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵیان...

لە بابەتەکانی ئەم پەرتووکە:

- بزۆکی منداڵ لە چییەوە سەرهەڵدەدات؟
- گرنگی کۆبوونەوەی خێزانی لەم تەمەنەدا
- دڵەڕاوکەی منداڵان لە ئەنجامی تاقیکردنەوە
- بەراوردکردنی منداڵان بە منداڵیی دایك و باوکان
- منداڵ و شت بیرچوونەوە
- بێزاریی منداڵان لە خەمساردی گەورەکان
- چۆن هەڵەی بۆ ڕاست بکرێتەوە؟
- شەڕی نێوان خوشك و براکان
- ئالوودەبوون بە تەکنەلۆژیاوە
- منداڵ کەی پەنا دەباتە بەر درۆکردن

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA MEDIA CENTER
www.aramediacenter.com
info@aramediacenter.com
facebook.com/ aramediacenter
instagram/ ara_media_center

0-0414-0000-3
9 780041 400007

نرخی (٤٠٠٠) دینارە